# ڕەوشتی بانگەوازیکاران

لە نووسینی

سلمان فهد العودة

وەرگێرانی

باوکی مەروان

هەولێر ١٤١٤ك - ١٩٩٤ز

# پێشەکی

ان الحمد لله، نحمده ونستعينه ونستغفره ونستهديه، ونعوذ بالله من شرور انفسنا، ومن سيئات اعمالنا، من يهده الله فهو المهتدي ومن يضلل الله فلن تجد له وليا مرشدا، واشهد ان لااله الا الله وحده لاشريك له، واشهد ان محمدا عبده ورسوله، صلى الله عليه وعلى اصحابه ومن سلك سبيله واهتدىٰ بهداه وسلم تسليماً كثيراً.

شتێکی دیارو بەرچاوەکەوا ئێستا لە سەرتا سەری جیهانی ئیسلامی‌دا هەوڵ و تێکۆشانێکی بێ ووچان هەیە بۆ زیندووکردنەوەی گیانی ئیسلام لە نێو کۆمەڵگا ئیسلامی‌یەکان. هەروەها هێنانەوەی بەندەکانی خودا بۆ ژێر سێبەری قورئان و سوننەتی بەرزی پێغەمبەر -ﷺ- بۆ ئەم کارەش ژمارەیەکی زۆر لە گەنج و پیری ئەم ئوممەتە پەیمانیان لەگەڵ خوادا بەستوەو خۆیان بەخودا فرۆشتووە، ئەم هەوڵ و کارانەش لە چوارچێوەی چەند کۆمەڵەو ڕێکخراوو دەستەولایەنی ئیسلامی‌دا خۆی دەنوێنێ.

مامۆستا سەلمان عوَدە وەکو خەم خۆرێکی ئەم ئیسلامەو دلسۆزێکی ئەم کاروانە، بەشێک لە ئەرکی سەر شانی خۆی بەرامبەر بەبانگەوازیکاران لەم کتێبەدا. بەجێ هێناوە.

منیش لەبەر گرنگی و سوود بەخشی ئەم ئامـۆژگـاریانە کە ئێجگار پێویستن بۆ بانگە وازیکارانی ڕێگای خودا بەقەدەر توانای خۆم دەستم دایە وەرگێرانی لە عەرەبیەوە بۆ سەر زمانی کوردی بە ئومێدی ئەوەی کە بانگـەوازیکـارانی کورد سوودی لێ وەربگـرن و بتـوانن بەم ڕەوشتانە خۆیان برازێننێننەوەو بە چاکترین شێوە بێنە مەیدان و ئەسپی خۆیان تاوبدەن بە ئاواتی گەیشت بە ڕەزامەندی خودای پەروەردگار.

وەمنیش داوای لێ بووردن و چاو پۆشی لە خوێنەری ئازیز دەکەم لە ئاست هەر هەڵەو کەم کوڕیەك کە لە وەرگێرانەکەوە سەری هەڵدابێ.

**والله ولی التوفيق**

**وەرگێڕ**

# بەناوی خوای گەورەو میهرەبان

ئەم رابـوونـە ئیسلامی‌یە لە ئێمەیەو ئێمەش بەشێکین لەو رابوونە، شکـومـەندیەکەی شکۆمەندی ئێمەیە، سەرکەوتنی سەرکەوتنی ئێمەیە، وئێمەش لە هەموو کەسێك دڵخوش ترین بەم رابوونە!

ئەو کەسانەی کە توانادارن نابێت تەنها بە (دڵ خۆشی) بەشداری ئەم رابـوونە مەزنە بکەن، هەر هیچ نەبێ ئەم دڵ خۆشی‌یە ببێتە ووشەیەکی بنیات نەر، یا ئامۆژگاریەکی سوودبەخش و بە مەبەست یان بە لایەنی کەمەوە سەرنج راکێشانێکی ژیرانەو بەسۆز بێت.

بەرێوەبردنی ئەم رابوونە ئیسلامیەش کاری تاکە کەسێك نیە، بەڵکو ئەرکێکە لە ئەستوی ئێمەو هەر کەسێکی ترکە خۆ بە موسلمان بزانێ.

دەبـا ئێمـەش لەم کاروانە پیرۆزە بەجێ نەمێنین و لە پیت و بەرەکە تەکەی بێ بەش نەبین.

**دانەر**

# بەناوی خوای گەورەو بەروەردگار

## « بۆ پێشەکی»

پێغەمبەری پێشەوامان -(ﷺ)- لە پارانەوە کانیدا دەیفەرموو «اللهم اهدني لأحسن الاخلاق، لايهدي لأحسنها الا أنت، واصرف عنيّ سيّئها، لايصرف عنيّ سيّئها الاّ أنت، لبيك وسعديك والخيرّ كله في يديك، والشر ليس إليك إنا بك واليك تباركت وتعاليت».

موسليم ريوايەتی كردووە

★★ ★★ ★★ ★★

«اللهم إني أعوذ بك من منكرات الاخلاق والاعمال والاهواء»

ترمذی ريوايەتی كردووە

★★ ★★ ★★ ★★

«اللهم حسنت خلقي فحسن خُلقُي»

ئەحمەد ريوايەتی كردووە.

★★ ★★ ★★ ★★

«اللهم إني أعوذ بك من العجز والكسل، والجبن والبخل والهرم والقسوة، والغفلة والعيلة، والذلة والمسكنـة، وأعوذ بك من الفقر والكفر، والفسوق والشقاق والنفاق، والسمعة والرياء وأعوذ بك من الصمم والبكم، والجنون والجذام والبرص وسيئ الاسقام»

المستدرك ١ / ٥٣٠_٥٣١

## ٢ ـ بەرزترین خورەوشت

خوورەوشت لە ئیسلامدا پلە و پایەیەکی بەرزی پێدراوە، هەروەکو لە فەرمـوودەی پێغـەمبەر ـ﴿ﷺ﴾ـ هاتووە دەفەرموێ: «إنّما بعثت لاتمم مكارم الاخلاق» لە ریوایەتێکی تردا بە:

«إنّمـا بعثت لاتمم صالح الاخـلاق[1]» هاتووە، ئەم فەرموودانەش ئەوە دەردەخەن کە ئەو کارە مەزنەی پێغەمبەری خوا ﴿ﷺ﴾ بۆ نێردراوە تەنها بریتی‌یە لە تەواوکردنی خوورەوشتی بەرز ئەمەش سەیر نیە، چونکە ئەگەر ئێمە بمانەوێت (خوورەوشت) بەوە لێك بدەینەوە کە بریتی‌یە لە:

★ چۆنیـەتی هەلس کەوت کردنی بەنـدە لەگەڵ خوداو لەگەڵ خەلکیدا ئەمەش ئایین دەگرێتەوە بە مانا فراوانەکەی چۆن لەگەڵ خوای بە دبهێنەر هەلس و کەوت دەکەی؟

چۆن دان بە تاك و تەنهایی دادەنێیت و دەیەرستی وەلەو شتانەش دوور دەکەویتەوە کە خوای گەورە رەزامەندی لەسەر نیە؟

وە چۆن لەگەڵ بەندەکانی خوا هەلس وکەوت دەکەی؟ ئەو بەندانە کە فریشتەکان و پەیغەمبەران و پیاوچاکان و خزم و کەس و کار دەگرێتەوە ئەوانەی کە مافی خۆشویستنیان

لەسەرمان هەیە، چۆن هەلس و کەوت دەکەی لەگەڵ دەکەی پەیکەی تر کە لە شەیتان و کافرو پیاو خراپ و دووڕووەکان پێك دێت ئەوانی کە ئەبی لەبەر خاتری خوا خۆشت نەوێن و رقت لێیان بێ.

---

١ـ (ئەحمەد) ریوایەتی کردووە، (مالك و بەزار) لە کتێبی (المجمع) ریوایەتیان کردووە.

★ وەیان ئەگەر خوو ڕەوشت بەمانا یەکی تایبەتی تر لێك بدەینەوە و بڵێین بریتی‌یە لە چۆنیەتی هەڵس و وکەوت کردن لەگەڵ خەڵکیدا ئەو بە گوێرەی ئەم مانایەش فەرموودەکەی پێغەمبەر -﴿ﷺ﴾- بەرزی‌و گرنگی ڕەوشت لەم ئایینــە پیرۆزەدا دەردەخــات، هەروەکــو دەفەرموێ: «الحج عرفــة»[1] لێرەدا مەبەست ئەوە نیە کەحەج کردن تەنها وەستانە لەکێوی عەرەفە، بەڵکو مەبەست ئەوەیە کەوەستان لە عەرەفە گرنگترین پایەکانی حەج کردنــە، وەکــو دەفەرموێ «الدِّين النصيحة»[2] مەبەست ئەوەیە کە ئامۆژگاری کردن پایەیەکی بەرزی هەیە لەئایینی ئیسلامدا.

کەوابــوو هەردوو ماناکە بەڵگەن لەسەر پلەو پایەو گرنگی ڕەوشت لە ئیسلام دا.

## ٢ - موسلمانێك... بانگەوازیکارە

لێرەدا پێویستە لەسەر موسلمان کە خۆی بەرەوشتی بەرز برازێنێتەوە، جا ئەم موسلمانە بانگەوازیکار بێ یان نا، چونکە ڕەوشتی بەرز لەئامانجە سەرەکیەکانی ئەم پەیامەیە.

کە وەکو دیاریەك بۆ مرۆڤی سەر ڕووی زەمین هاتووە وە بە تایبەتی دیــاری‌یە بۆ کۆمەڵی ئیمانداران، ئەم پەیامە مرۆڤ بەرەو ڕێگای ڕاست ڕێنمــوونی دەکــات، دەروونیــان پاك دەکاتەوە، ئەو شتانەیان فێر دەکات کەنەیان زانیوە «هو الذي بعث في الاميين رسولاً منهم يتلوا عليهم آياته، ويــزكيهم، ويعلمهم الكتــاب والحكمــة، وان كانــوا من قبل لفي ضلال مبين»ــــ (الجمعة، ئایەتی: ٢)

---

(١) [ترمزی، ئەبوداود، نەسائی، ئیبنوماجە، دارمی] ڕیوایەتیان کردووە.

(٢) [موسلیم، ئەبوداود، نەسائی] ڕیوایەتیان کردووە.

بەڵی هەر لەم ئایەتەشدا (ویزکیهم) مەبەستی پاک کردنەوەی دڵ و دەروونەوە پەروەردەکرد نیەتی لەسەر رەوشتی بەرز و پاک کردنەوەی لە خورەشتی ناشیرین.

جا ئەگەر رەوشتی بەرز پێویست بێت بۆ تاك تاکی موسلمانان.... باشە دەبێ چۆن بێت بۆ ئەو کەسەی کە خۆی بە هەلگری ئاڵای ئیسلام و دروشمەکانی دەزانی...و لە نێو خەڵکی بانگەوازی بۆ ئەم ئیسلامە دەکات؟... بێ گومان ئەوجۆرە کەسانە دەکەونە بەرچاوی تیژی خەڵکو بەر رەخنەو رەخنەسازی خەلکەوە، بۆیە بچوکترین هەڵەو عەیب جێی سەرنجی خەلك دەبێت و لەسەریان گەورە دەکرێ جا ئەبێ بانگەواز یکارانی رێگای خودا راستی بانگەوازەکەی بە خوو رەوشت و ئاکاری جوان بسەلمینی ئازیزان:- رەوشتی بەرزو ئاکاری شیرین زۆر پێویستن بۆ کە سانێك کە هەلگری ئەم پەیامەی خوان بەڵی زۆر پێویستە بۆ پاراستنی ئەم بانگەوازەو هەلگرانی لەتانەو تە شەری داخ لەدڵان و پێنووسی ناحەزان و، خەیاڵاتی گیلەپیاوو نەفامەکان!

## ٤- خالێکی تر:

ئەگەر بمانەوێت لەسەر (رەوشت) بڕۆین بابەتەکە درێژە دەکێشی، چونکە چەندەها سەرچاوەمان لە ژێر دەستدایە بۆ ئەم باسە! وەکو:

«اخلاق النبيّ» کە ابي الشيخ الاصبهاني نووسیویەتی وە «مکارم الاخلاق» کە طبراني وخرائطي نووسیویانە، وە «الاخلاق والسير» کە ابن حزم نووسیویەتی و، کتێبی «دستور الاخلاق في القرآن» کە محمد عبدالله الدران نووسیویەتی... کەلێکی تریش.

**خوێنەری ئازیز:ـ**

**ئەم نامیلکەیە تەنها خستنەوە بەرچاوو بەبیر هێنانەوەی بەرزی و گرنگی ڕەوشت و ئاکارەکانە، کە مەبەست بەگرنگی‌یان دەکەم بۆ موسلمانی بانگەواز یکار وەتیایدا تەنها باسی چەند لایەنێکی گرنگی ئەم ڕەوشتانەم کردووە. سەرچاوەش لەسەر ئەو باسە زۆرن ئەوەی بیەرێ زیاتر لێی بکۆلێتەوە....**

---

## یەکەم:ـ ڕاستگۆیی «الصدق»

**«یاأیها الّذینَ آمنوا اتّقوا اللّه وکونوا مع الصادقین»**

**(التوبه:ـ ئایەتی: ۱۱۹**

واتە: ئەی کۆمەڵی بڕواداران پارێز بکەن لە خوداو لەگەڵ ڕاستگۆیان دابن.

زۆر کەس واتێدەگات ڕاستگۆیی تەنها ڕاستگۆیی‌یە لە قسەکردندا بەڵام لە ڕاستیدا (ڕاستگۆیی) بەرنامەیەکی گشتی و فراوانە، خاسیەتێکە لە خاسیەتەکانی شەخسیەتی موسلمان چ لە ناوەوەی بێ یان لە دەرەوەیدا وەلەقسەو کردەوەکانی دەردەکەون و ڕاستگۆیی لە چەندین بواردا خۆی دەنوێنێ:ـ

### ١ـ ڕاستگۆیی لە هەلگرتنی ئاینیی خوادا:

ئەو ڕاستگۆیی‌یە بەوە دێتەجێ کە دینداری موسلمان دینداریەکی ڕاستەقینە بێت و لەسەر ئەساسی ڕاستگۆیی لەگەڵ خوادا بێت، نەك

لەسەر بناغەی دوو ڕوویی‌و درۆو ناڕاستی بۆیە دەبینین لە قورئاندا ڕاستگۆیی «الصدق» بەرامبەر دووڕوویی «النفاق» بەکار هاتووە «ليجزي الله الصادقين بصدقهم ويعذب المنافقين ان شاء أو يتوب عليهم»
(الاحزاب، ئایەتی: ٢٤)

جا پێویستە ئیمان و بروایەکی بەتین بەخواو ڕۆژی دوایی‌و فریشتەکان و کتێبە پیرۆزەکانی خواو پێغەمبەران لە دڵ و دەروو ندا دامەزرا بێت، لەگەڵ موسلمانەتیەکی ئاشکرلەڕووالەت وهەلس وکەوتدا، پێویستە موسلمان کردەوەو ئاکاری لەگەڵ ئیمانی نێو دڵ و دەروونی هاوئاهەنگ بێت.

زۆر جار موسلمانی بانگەواز یکار بە خەیالی دادێت کە هەندێك کرداری چاك ئەنجام نەدات لە ترسی ئەوەی نەوەك لەدڵەوە نەبێت یان ئەڵێ ئیما نەکەم ئەوەندە نیە بۆیە ئەم کارمیان ئەم سوننەتە ئەنجام نادەن ئەمەشیان بۆسەیەکی ترە لە بۆسەکانی شەیتان ئەبێ موسلمان خۆی لێ بپارێزێ تا تووشی ئەم هەڵە گەورەیە نەیەت.

هەر کردەوەیەکی چاك کە موسلمان بە ئەندامەکانی ئەنجامی دەدات هۆیە کە بۆ چاك بوون و ڕاست بوونەوەی دڵ بە مەرجێك بۆ ڕیبازی‌و ناوەدەنگ و هەڵفریواندنی موسلمانان نەبێت.

## ب ـ ڕاستگۆیی لەقسە کردندا:ـ

ڕاستگۆیی لەقسەکردندا کەسایەتیەکی ڕۆشن و ئاشکراو پیاوەتی و پایە داری ئەوکەسە دەردەخات، تەنها کە سانێك پەنا دەبەنە بەر درۆکردن کە مرۆڤی گەوج و دەروون پیسن و، بی شەخسیەتن، هەموو ویژدانێکی ساغ درۆکردن بە کارێکی خراپ و عەیبێکی گەورە دەزانێ، هەر بۆیەش هەموو ئایینە ئاسمانیەکان درۆکردنیان قەدەغەکردووە بە تاوانیان لەقەڵەم داوە.

ئەی بۆ موسلمانێ کە هەلگری پەیام بانگەوازی خوایی بێ.... دەبێ قەت درۆی لێ چاوەڕوان بکرێت؟ بێ گومان، نەخێر ئیشاء الله ئەمە هەرگیز روونادات بەلام:ـ

هەندێ موسلمان هەن کە جاری وا هەیە قسەیەك دەکەن بەمەبەستێك، بەلام خەلکی بە جۆرێکی تر لێکی دەدەنەوە وتێی دەگەن لە پاشان کە دەبینن کارەکـە بەم جۆرە نەبـوو کە ئەوان تێ گەیشتبون یەکسەر ئەو موسلمـانــە بەدرۆزن دەدەنــە قەلەم وتــاوانبــاری دەکەن، جا پێویستە موسلمان زۆر ئاگاداری قسەکانی خۆی بێ، چونکە بەر پرسیارە بەرامبەر هەر قسەیەك کە دەیکا چونکە موسلمانی بانگەوازیکار نوێنەری بەرنامەی خودایەو نمونەی ئەو و کەسانەیە کە هەلگری بەرنامەی خودایەو نمونەی ئەو کەســانــەیە کە هەلگری بیرو باوەڕو ربیازی ئیسلامین و دەیانەوێ ئیسلام جارێکی تر لە دلی موسلمانان زنیدوو بکەنەوە.

جا براو خوشکی موسلمان:ـ

کە هەلویستێك زۆرت بۆ دەهێنێ درۆ بکەی نەکەی خۆت تووشی ئەم تاوانە بکەی، چونکە موسلمان درۆ ناکات، لەوەش زیاتر ئەوە ئەبوسوفیانی بێ باوەڕەکە لەبەردەم (هیرەقل) پاشای رۆم وەستاوە پرسیاری لێ دەکرێ دەربــارەی شەخسیــەتی پێغەمبەر ـ﴿ﷺ﴾ـ لەوەلامدا دەلێ:ـ وەللاهی ئەگــەر بزانم درۆیــەکانم لێ سەی نابنەوەو بە چاوم دانادرێنەوە ئەوەی قسەی راست بێ لەسەر موحەمەد نەیکەم[1] !

(چونکە پێی خۆش نەبوو لەپێش هێرەقل مەدحی موحەممەدێك بکات کە دوژمنیەتی) بەلام درۆشی نەکرد.

موسلمــانــان و هەلگــرانی بانگەوازی خوایی ئەبێ زۆر بارێز بکەن نەکەونە بەر هێرش وتانەو تەشەری نەفام و نا حەزان.

---

(١) (بـوخاری) ریوایەتـی کردووە.

## ج ـ راستی ودروستی کردەوە:ـ

لێرەدا مەبەست ئەوەیە کردەوەکانی مرۆڤ بەتەنها بۆ خوا بێت، دوور بێت لە هەموو ریابازیو ناوەدەنگیەك «فمن كان يرجوا لقاء ربه فليعمل عملاً صالحاً ولا يشرك بعبادة ربه احداً» (الكهف:ـ ١١٠) هەروەها دەفەرمووێ:ـ

«ليبلوكم ايكم أحسن عملا» (الملك:ـ ٢) «فضيل كوڕی عياض) ئەڵێ (أيكم أحسن عمــلًا) واتــە: باشترین کردەوە کانتان لای خوا: اخلصه واصوبه:ـ پاکترین و راستترینیان.

**قيل: ما اخلصه واصوبه؟**

قال:ـ إن العمــل اذا كان خالصاً ولم يكن صوابا لم يقبل واذا كان صواباً ولم يكن خالصاً لم يقبل، لايقبل حتىٰ يكون خالصاً و صواباً! کەوابوو:ـ

خوای گەورە ئەو کردەوانە وەرگرێت کە ئەو دوو مەرجەی لێ دێتە جێ بەیەکەوە:ـ

یەکەم:ـ (خالصاً) واتە (خالصاً لوجه الله) بێت بەتەنها نیە تت بۆ خوا بوو بێ و بەس.

دووەم:ـ (صوابا) واتە (صائبا لايخالف شرع الله) کارەکەت راست بێت لەگەڵ شەرعی خوا بگونجێ جا هەر کارو کردەوە یەك، هەر پەرستنێك ئەو دوو مەرجەی بەیەکەوە لێ نەیەتە دی خوای گەورە قەبووڵی ناکات، جا با بەرز ترین کردەوەش بێت، با نوێژ بێت یازەکان بێت، یا جیهاد کردن بێت.. تاو.

هەروەهــا روونی و ئاشکرایی کردەوەو پێچ و پەنا نەکردن نیشانەی راستگۆییە لە کردەوەدا، لە ریوایەتێکدا ئەبودا ودو نەسائی دەگێرنەوە کەوا

پێغەمبەر -﴿ﷺ﴾- لە ڕۆژی ئازادکردنی شاری مەککەدا خوێنی (عبد الله ابن ابي السرح)ی حەلال کرد، ئەو عەبـدوڵایە لە پەنای عوسمانی کوڕی عەففـان هات بولای پێغـەمبەر -﴿ﷺ﴾- بۆ ئەوەی ببیە خشێ و پەیمانی لێ وەربگرێ، پێغەمبەر -﴿ﷺ﴾- سەری بەرزکردەوە ویسێ جار تەمـاشـای کردو وەڵای نەدایەوە، پاش ئەوە ناچار پێغەمبەر -﴿ﷺ﴾- پەیمانی لێوە. گرت بەرێی کردو بە هاوەڵەکانی فەرمووی:- ئەرێ ئێوە پیـاوێکی ژیـرتـان تیـا نەبـوو کاتێ کەمن وەڵامم نەئـەدایەوە یەکسەر بیکـوژتبـایـە؟ ووتیـان:- ئەی پێغـەمبـەری خوا ئێمە نەمان زانی ئەو مەبەستەت هەبوو، هەر بە چاوێك ئیشارە تێکت بکردبایە ئێمە ئەمان کوشت!!

پێغەمبەر -﴿ﷺ﴾- فەرمووی : (انه لاینبغي لنبي ان تکون له خائنة الاعین) ئەم کارە لە هیچ پێغەمبەرێك من ڕێك ناوەشێتەوە، تا ئەو ڕاددەیە ڕاستگۆیی لە کردەوەکانی پێغەمبەر دا -﴿ﷺ﴾- بەدی دەکرا، ئەمە خوو ڕەوشتی بوو، ئاماد نەبوو سەرسەخترین دوژمنی خۆی بەفێڵ و پێنج و پەنـا بکـوژێت، هەر بۆیەش بت پەرستەکان لەسەرەتای هاتنی ئیسلام نەیانتوانی پێی بڵێن:- درۆزن بەڵکو پێ یان دەوت شاعیرە.. سیحربازە... شێتە، بەڵام کەس بڕوای بەم قسانە نەکرد، ئنجا کەزانیان هیچیان پێ نەما ووتیان درۆزنەو درۆ دەکات! بەڵام کەسێك ئەم بو ختا نەشی لێ نەکرین.

ئیمامی ترمذی لە عەبدوڵای کوڕی سەلامی ریوایەت کردووە، دەڵێ:- کاتێ کە پێغەمبەر -﴿ﷺ﴾- تەشریفی هینا بۆ شاری مەدینە خەڵکی بۆ پێشوازی کردنی هاتن، ووتیان پێغەمبەری خوا هات، منیش وەکو خەڵکی تر چووم بۆ پێشوازی کردن و دیدەنی، کە تەماشای رووی پێغەمبەرم کرد

بۆم دەرکە وت کە ئەم رووە رووی کەسێك نیە، کە درۆزن بێ و، درۆ لەگەڵ خەڵکی بکات.

راستگـۆیی و پاکی پێغـەمبەر -ﷺ- لە دڵیەوە بوو وەلەزوبان و ئەنـدامـەکـانی یەوە دەردەکـەوت، وەك تووریـێـك لە رووی پیرۆزیـدا ئەدرەشایەوە، هەر کەسێ کە سەیری نوورو نەزەری پاکی بکردبا راستی و راستگویی ئەخوێندەوە و ئەیزانی درۆ کردن لەم رووە پاکە ناوە شێتەوە.

ئێمەش ئیمرۆ پێویستمان بە کۆمەڵێك لەم جۆرە بانگەوازیکارانە هەیە کە راستگـۆیی لەگـەڵ خوێنیـان تێکـەڵ بێ و ببێتە نوورێك لە روویان دەرکەوێ، هەر کەسێ بیان بینێ بڵێ اشهد بالله ئەم رووە پاکانە رووی درۆ زنان نیە!

پێویستمان بە جۆرێك لە موسلمان هەیە ئەوەندە هێمن بن و ئەوەندە هاوسـەنـگ بن لەقسـەو کرداردا، هەموو کەسێ بڵێ:- بەراستی ئەمانە رەوشتی پێغەمبەرانیان هەلگرتووە!

راستگویی ئێمەی بانگەوازیکار لە هەلگرتنی ئەم بەرنامەو پەیامەدا، وا لە خەڵکی دەکات پەیامەکەمان لێ وەربگرن نا بێت ئێمە وەکو ئەکتەر لەسەر شانۆیە بەرگێك خۆ وەدەرخەین و لە راستیدا شتێکی تر ببن ئەم جۆرە کەسانە زوو بۆ خەڵکی دەردەکەون ئاشکرا دەبن و خەڵکیش لێ یان دوور دەکەونەوە.

لە موسلمانانی پێشوومان دەگێرنەوە کە هەندێکیان لە قسەو ووتار تاوو تینێکی وەهـایـان هەیە بە جۆرێك ئامادەبووان دەخەنە نێو فرمێسك و گریانەوە، بەلام هەندێکی تریان ئەگەرچی زۆر لەوان زاناو قسە زانتریش بەلام ناتوانن کار لەکەس بکەن و کەس بخرۆشێنن، توانایان نیە هەست و سۆزی خەڵك بجولێنن و گیانی ئیسلامی یان زیندووبکەنەوە.

پرسیاریان له پێشوەکانمان کردووە، هۆی ئەمەچیە؟ ووتیان :
گریـان و واوەیـلای زگ سووتـاو وەك هی بەکرێ گیراونیـیە کەواتە یەکەمین هۆی سەرکەوتنی بانگەوازیکار راستگۆییـیە لە هەلگرتنی پەیامی خواییدا.

دەبێ راستگویی ببیتە دروشمێك لە پەیرەوەماندا لەقسەو کردارماندا، خۆ گرنگ هەر ئەوە نیە ئێمە خەریکی ووشەی ڕازاوەو بریقەدار بین بەڵکو لەو گرنگ تر راستیە لە قسەو کرداردا، دەبێ مرۆڤ لەگەڵ زاتی خۆیدا

راست بکات و قسەکانی لە ئێش و ژانەوە هەلقولا بێ، هەروەکو ئەڵێن:ـ
ئەو قسەیەی کەلەدڵەوە دەردەچێ دەکاتەوە دڵان، وە ئەو قسەیەش کە هەر لەزارەوە دەردەچێ لەگوێچکان تێ ناپەرێ !!

## دووەم: ئارامگری «الصبر»

ئارامگری و یەقین جمکی یەکترین، هەروەکو خوای گەورە لەم ئایەتە پیرۆزەدا دەفەرموێ:
«وجعلناهم أئمة يهدون بأمرنا لما صبروا وكانوا بآياتنا يوقنون» (السجدة: ٢٤)

بۆیـە سوفیـان دەڵێ: «بـالصبـر واليقـين تنال الامامة في الدين» بە ئارامگرتن و دڵنیا بوون (اليقين) پێشەوایەتی بۆ ئەم ئایینە دێتە کایەوە، هەر کەسێ ئارامگر نەبێ و خۆڕاگر نەبێ ناتوانێ ئاینەکەی بپارێزی بەڵکو هەر بە ئاسـانی، هەر بە چاوو راوێـك و هەرەشـەیـەك بیروباوەرەکەی دەدۆڕێنێو خۆی لەدەست دەدات! بۆیــە خوای گەورە دەربـارەی ئەم بابەتە دەفەرموێ:
«فاصبر ان وعدالله حق و لا يستخفنك الذين لا يوقنون» (الروم: ٦٠)

واتە: خۆ ڕاگرە، ئارامبگرە بەڵێنی خوای گەورە ڕاستەو دەگاتە جێ، نەت ترسێنن ئەو کەسانەی کە باوەڕیان دانەمەزراوە.

**«واصبر على ما يقولون واهجرهم هجراً جميلاً»**

**(المزمل: ١٠)**

سەبرو ئارام بگرە لەسەر قسەو تانەو تەشەری بێ باوەڕان و ناجەزانی ئیسلام.. تاد

زۆر جار ئەو کۆمەڵانەی کە گومڕاو سەر لێشێواون بەربەرەکانێی بانگەوازیکاران دەکەن و بەگژیاندا دەچنەوە... ڕێیان پێ دەگرن.. گیروگرفتیان بۆ دروست دەکەن، پێیان دەڵێن:

ئەو شتەی ئێوە هەوڵی بۆ دەدەن و بانگی بۆ دەکەن خەون و خەیاڵە و لەم واقیعەشدا جێی نابێتەوە!!.

ئێوە بۆ شتێك هەوڵ دەدەن و بانگی بۆ دەکەن کە کاتی بە سەردا چووەو مۆدێلی نەماوە!!

خەڵکی تازە شوێن ئەم شتانە ناکەون!! جا پێویستە ئێوە بە شتی تر ڕازی بن و بە خۆدا بچنەوەو خۆتان ڕاست بکەنەوە!!

جا لە ژێر فشاری ئەو واقیعەی کە تیایدا دەژین و ئەو کۆسپ و تەگەرانەی کە دێنە پێش چەسپاندنی ئەم ئیسلامە هەندێ لە بانگەوازیکاران لەسەر ئەم ڕێگا دوورو درێژە دەکەونە ژێر کارتێکردنەوەو بە قسەی دوژمنان سارد دەبنەوە دێن پیاچوونەوە بە خۆیان و بە ئیسلامەکەیاندا دەکەنەوە! خۆزگە ئەم بە خۆدا چوونەوەیە بە گیانێکی لە خۆ بووردوویی‌و بە نیازی لێکۆڵینەوەو دۆزینەوەی هەڵەکان ئەبوو. نەك بە گیانێکی بەزیوانە وەکو ئەو کەسەی کە لە جەنگدا شکستی خواردبێ یا بەدیل گیرابێ. جا بیەوێ بە دوای ڕێگایەك دا بگەڕێ کە خۆی لە گەڵ ناهەق و واقیعی ناهەموار و فەساددا بگونجێنێ لە گەڵیا تێك نەگیرێ!

بۆ نموونە:

ئەو سووت خۆریەی (ربا)یەی کە بڵاوبۆتەوەو پەلی هاویشتووەو ئابووری جیهانی لەسەر دامەزراوە، بگرە لە جیهانی ئیسلامیشدا خەریکە بچێتە گیرفانی گشت کەسێکەوە، هەروەکو لەم فەرموودەی پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ هاتووە:

«یأتی علیٰ الناس زمان من لم یأکل الربا اصابە غبارە»[1] واتە:

زەمانێك بەسەر خەڵکدا دێت ئەگەر کەسێك سووتیش (ربا)ش نەخوات، تۆزو غوبارەکەی بەردەکەوێ، ئەم فەرموودەیە ئەگەر ریوایەتەکەش لاواز بێت بەڵام راستی مەبەستەکەی لەم فەرموودەیە دەردەکەوێ کە ئیمامی بوخاری ریوایەتی کردووە:

«یأتی علیٰ الناس زمان لایبالی المرء ما اکل امن الحلال ام من الحرام» واتە:

زەمانێك بە سەر خەڵکدا دێت، کابرا گوێ ناداتێ ئەوەی کە دەیخوا ئایا لە حەلاڵی پەیدا کردووە یا لە حەرام؟!

ئەم حەرامە کەوتۆتە دڵ و دەروون و گیرفان و دام و دەزگاو سەروەت و سامـــانی بە شێکی زۆری خەلکـــەوە، لێرەدا پێـویستـە موسلمـانـانی بانگـەوازیکـار بە رۆڵی خۆیـان هەڵسن، خۆیـان و خەڵکی لێ بە دوور بخەنەوە، چارەرەسەری ئەم حەرامە بکەن بە شتێکی لەو چاکتر و پاکتر لە هەمان کاتدا راست و شەرعی بێت، بۆ ئەوەی خەڵکی بتوانن ئابووری خۆیان ببوژێننەوە، سەروەت و سامانی خۆیانی پێ زیاد بکەن.

ئەبێ ئابووریەکی ئیسلامی پێش کەش ئەم خەڵکە بکرێت، نەك لە ژێر تەوژم و فشاری کەسانێکی بێ باوەڕ، یا باوەڕ نزم پیاچوونەوە لە مەسەلەی

---

(١) (ئەحمەد، ئەبوداود، نەسائی، ئیبنوماجە) ریوایەتیان کردووە.

سووت (ربا) بكەين و هەوڵ بدەين حيلەی شەرعی بۆ بدۆزينەوەو كابرای سووت خۆری پێ دەرباز بكەين!
بە هيچ جۆرێك نابێت موسلمان هەوڵی ئەوە بدات خۆی لە گەڵ فەسادیو خراپكاريەكانی ناو ئەو واقيعە بگونجێنێ.
نابێت ئێمە واقيع بكەين بە سەرچاوەو لە پێناويدا فەرمان و شەرعی خوای لەسەر بگۆڕين، بەڵكو دەبێ بە پێچەوانەوە واقيع بگۆڕين و لە گەڵ شەرعی خوادا بيگونجێنين.
هەر دابەزينێك لەم جۆرە ئەنجامی ووره نزمیو بێ ئارامی یە لە دەروونی بانگەوازيكاراندا، هەر كاتێ كە ئارامگرتن نەما ئومێدو ئاواتەكانيش نامێنن.

ئێمە ئەوەمان لێ داوا نەكراوە ئەبێ سەركەوتنێكی بەرچاو بۆ ئيسلام بەدی بهێنـين. بەڵكـو ئەوەمان لێ داواكراوە كە هەوڵ و كۆشش بكەين، هێزو توانـای خۆمان بخەينە گەڕ لەم مەيدانە، پێغەمبەرانی خواش (سلاوی خوايان لێ بێ) هەر ئەوەندەيان لێ داواكراوە
«ان عليك الا البلاغ» (الشورى: ٤٨)
واتـە: تۆ تەنهـا ئەوەنـدە لەسـەر شانتـە پەيـامەكەی خودا بگەيەنێ، پێغەمبەرانی خواش (سلاوی خوايان لێ بێ) ئەيان فەرموو: «وما علينا الا البلاغ المبين» (يس: ١٧)
بەڵێ تەنها راگەياندنی ئەم پەيامە لە ئەستۆی ئێمەيە نەك ئەنجام و بەرهەمەكەی.
دەبينی يەكێـك پەخـەگـيرت دەبێو پێت دەڵێ تۆ ئەوەندە هەوڵ ئەدەی، ئەوەنـدە ماندوو ئەبی، بۆچی هەوڵەكەت بەرهەمێكی نيە؟ بە شەوو رۆژ خەڵك بانگ دەكەی كەچی خەڵكی زياتر لێت دوور دەكەونەوە، ئەوەی تۆ لە ساڵێكدا بينات كردووە ئەوان لە سەعاتێكدا دەيرمێنن!!

بەلام ئەم جۆرە قسانە کار دەکەنە سەر یەکێك کە هێشتا شارەزای ئیسلام و سوننەتەکانی خوای گەورە نەبووبێ. کۆسپ و تەگەرەکانی سەر ڕێگای نەدیبێ.

جا لێرەدا، ڕۆڵی ئارامگری و خۆ ڕاگری (الصبر) دەست پێ دەکات، خەبباتی کوڕی ئەرەت (ڕەزامەندی خوایان لەسەر بێت) بۆمان دەگێڕێتەوە کە ڕۆژێك چوومە لای پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ لەو کاتەدا لە ژێر دیواری کەعبە پاڵی دابۆوە عەبایەکی لە ژێر سەری دانابوو، منیش لێی چوومە پێش و گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە بە دەستی ئەم بت پەرست و خوا نەناسانە تووشی ئازارێکی زۆر بووین، بۆچی بۆ لە خوا ناپارێیتەوە؟ بۆچی داوای سەرکەوتن لە خوا ناکەی؟ لە تاوی ئەم قسانە پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ سوور هەڵگەڕاو دانیشت، فەرمووی:

«لقد كان من قبلكم يمشط بمشاط الحديد مادون عظامه من لحمٍ أو عصبٍ ما يصرفه ذلك عن دينه ويوضع المنشار على مفرق راسه فيشق باثنين مايصرفه ذلك عن دينه، ولتمّن الله هذا الأمر حتى يسير المراكب من صنعاء الى حضرموت مايخاف الآ الله والذئب على غنمه... ولكنكم تستعجلون»[1]، واتە:

برادەرانی پێش ئێوە بە شانەی ئاسن ئێسقان گۆشت و دەمارەکانیان لە یەکتری دائەڕنی بەمەش هێشتا لە باوەڕەکەی شل نە ئەبوو، مشاریان ئەخستنە سەر تەوقی سەریان و ئەیانکردن بە دوو لەتەوە هەر سووربوون لەسەر ئایینەکەیان، خوای گەورە ئەم ئایینەی خۆی بە ئەنجام دەگەیەنێ، تاوەکو ڕێبوار لە سەنعاوە دەچێت بۆ حەزرەمەوت بێ ئەوەی لەشتێك بترسێ مەگەر لە خوا یان گورگێك بکەوێتەو نێو مەڕەکانیەوە... بەلام ئێوە پەلە دەکەن"؟..

---

(١) (بوخاری، ئەبوداود، نەسائی) ڕیوایەتیان کردووە

پەلە کردن بۆ گەیشتن بە ئەنجـام و بەروبـوومی بانگـەواز هەرگیـز ناگونجێ لەگەڵ ئەو سەبرو ئارامەی کە پێویستە بانگەوازیکاران هەیان بێت.

وا دەبێ بانگەوازیکار لە شوێنێك دایە (لەشارێك لە قوتابخانەیەك دا، لە دائیرەیەکدایە، یا لە هەر دام و دەزگایەکی تر بێ...) بەرهەڵستی لەو کارە بێ شەرعیانە دەکات کە هەستی پێ دەکات و بانگەوازی خۆی دەکات بەرەو ئیسلام، زۆر خێرو چاکەی دەبێ، بەڵام خۆی وای هەست پێ‌ناکات، چونکـە کاریگەریەکەی ووردە ووردە پێ بەپێ‌یە، هەروەکو باوکێك چۆن هەست بەوە ناکات کە منداڵەکەی هەموو رۆژێك لەگەشە کردا ندایە، چونکە گەشـەکـردنەکەی لەسەرەخۆیە. چەندان بانگەوازیکار شوێنی، خۆیان چۆڵ کردووە، وایان زانیوە هیچ رۆڵێکیان نیە، بەڵام دوای ئەوە هەستیان بەم بۆشاییی‌یە کردووە کە دروستیان کردووە، هەروەکو گوتراوە : (مانگ تا ئاوا نەبێ قەدری نازانرێ شەو شەوەزەنگیش هەرچەندی تاریك بێت ناتوانێت رووناکایی مۆمێك بشارێتەوە،

جا پێویستە لەسەر بانگەوازیکار پەلە نەکات بۆ گەیشتن بە سەرنجام، بەڵکو ئەبێ هەوڵ بدات و پشتیشت بەخوا قایم بێت.

ئەزمـوونـەکـانی پێشوو لە مێژوودا ئەوەمان بۆ دەردەخەن کە هیچ هەولێك بێ بەرهەمْ نیە، نەبووە یەکێك لە نێو ئەم ئوممەتەدا هەولی دابێ‌و بەرهـەمێکی نەبـووبێ یاخود خەڵکی گوێیان بۆ نەگرتبێ، یا زانایەك دانیشتبێ‌و خەڵکی دەوریان لێ نەدابێ!

هەر کەسێـك بانگـەوازیـەکی کردبێ خەڵکی بەدەم بانگەوازەکەیەوە هاتوون، بگرە لە نێو گەلانی بێ باوەر

وەکو گەلانی ئەورووپا و ئەمریکاو زۆر جێگای تریش کە بانگەوازیکاران بانگیان دەکەن بۆ دینی خوا، بەکۆمەڵ بەدەم ئەم بانگەوازەوە دێن و رێگای

خوا هەڵدەبـژێـرن، هەفتـانـە دەیان کەس لە پیاوو ئافرەت دێنە ریزی کاروانی خواناسانەوە.

کە ئەڵێـین هیـچ هەوڵێـك بێ بەرهـەم نیـە راستێکـە شەرعی خوا سەلـاندوویەتی، هەروەکو لەم ئایەتەدا خوای گەورە دەفەرمووێ «فمن یعمل من الصالحات وهو مؤمن فلا کفران لسعیه وانا له کاتبون» (الانبیاء: ٩٤)

«لیجزی الله الصادقین بصدقهم» (الاحزاب: ٢٤)

وەلە فەرموودەی پێغەمبەریشدا ﷺ هاتووە: [من دعا الیٰ هدیٰ کان له من الاجر مثل اجور من تبعه، من غیر ان ینقص من اجورهم شیٔ][1]

[من سنَّ في الاسلام سنة حسنة فله اجرها واجر من عمل بها من بعده الیٰ یوم القیامة][2]

ئەم فەرموودانە وادەگەیەنن هەرکەسێ کارێك بۆ خوا ئەنجام بدات، خەڵکی لێیەوە فێر ببن و ئەنجامی بدەن، لە خێرو پاداشتی ئەوانیش بەشدار دەبێ هەتا رۆژی قیامەت.



(١) موسلیم: ترمذی، ابوداود) ریوایەتیان کردووە.

(٢) (موسلیم، نەسائی) ریوایەتیان کردووە.

## سێیەم: خۆبەزل نەزانین «التواضع»

خۆ بەزل نەزانین [1] دەتوانین بڵێین ئەوە دەگەیەنێ کە کەسێك نرخی خۆی بزانێ و خۆی بناسێ، وە هەروەکو پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ خۆبەزل زانین (الکبر)یش بریتی‌یە لە قەبوول نەکردنی هەق و بە سووك سەیر کردنی خەڵکی.

خۆ بە کەم زانین و سادەیی زۆر پێویستە بۆ کەسانێك کە خاوەنی شتێکن و، کارێکیان لە بەردەستدایە. بۆ ئەوەی خۆیان لێ نەگۆڕێ، وەپێیان دەڵێین:-

تواضع تکن کالنجم لاحَ لناظرٍ
علیٰ صفحات الماء وهو رفیع.

وەك ئەستێرە وایە هەرچەندە بەرزە بەڵام لەسەر رووی ئاودا خۆی نیشانی خەڵك دەدات!

ئەگێڕنەوە کەوا عەبدوڵای کوڕی موبارەك چووە خوراسان، لەوێ چووە سەردانی پیاوێکی خواناسی بەناوبانگ کەڵی چووە ژوورێ هیچ ئاوڕی لە عەبدوڵا نەدایەوەو خۆی تێك نەدا! عەبدوڵای کوڕی موبارەکیش

ژوورەکەی بەجێ هێشت، هەندێك لە ئامادە بووان بە کابرایان ووت تۆ نەت زانی ئەوە کێ بوو هاتبوو بۆلات؟ ئەمە فلانەکەس بوو فلانەکارەیە

---

(١) ووشەی «التواضع» لە کوردی‌دا چەند ووشەیەکی تری لە بەرامبەرد بەکارهاتوە، وەکو: بێ فیزی، سادەیی، بێ‌لاق، خۆ بەکەم زانین.. تاد.

وەرگێ

ئنجا کابرا بەشەرمەزاریەوە بەدوایی عەبدولّادا رای کردو داوای لیّ بوونی لیّکردو ووتی: بمبورە هەندیّ ئامۆژگاریشم بکە!

عەبدولّاش وەلّامی دایەوەو پیّگوت: بەلیّ.. ئەگەر لە مالّەکەت وەدەرکەوتی بەچاوی سووك سەیری هیچ کەسێك مەکەو خۆشت لە خەلّکی بە چاکتر مەزانە!

کاتیّ کەبینی کابرا زۆر شانازی بەخۆیەوە دەکات و خۆی بەزلّ دەزانیّ ولووت بەرزی دایگرتووە ئامۆژگاری لیّکرد چونکە دەیزانی خۆ بەزل زانین دەردیّکی کوشندەیە بۆ خواناسان.

ئەم دەردەش هەندیّ جار تووشی موسلّمانان و بانگەوازیکاران دیّت، بەتایبەت ئەو قوتابیانەی کە تازە فیّری زانین زانیاری دەبن و هیّشتا بەتەواوی شارەزایی یان لە ئیسلام پەیدا نەکردووە، یالە هەموو لایەنەکانی شەرع ئاگادار نین، ئەوانە هەندیّ جار تووشی بیّ ئەدەبی دیّن بەرامبەر مامۆستاکانیان و زاناکانیان، لە راستیدا ئەمەش جیّگای داخ و خەفەتە!

بوونی جیاوازی لە راو بۆ چوونیّك لەگەلّ زانایەك یا بانگەوازیکاریّك کاریّکی ئاسایییە ئەگەر گەیشتی بە ئاستیّك کە شارەزا بووبی، بەلّام نەبیّتە هۆیەك بۆ سووك کردن و ریسواکردنی ئەم زانایە یا بیّ نرخ و بیّ حورمەت کردنی، ئەمە ئەگەر بوکەسانیّکی سادەو عەوامیش ببیّ، بۆ ئەهلی بیدعەت بگونجیّ، بەلّام بۆ ئەهلی سوننەت و قوتابیانی شەریعەت هەرگیز نابیّ و ناگونجیّ.

زانایانی ئەهلی سوونەت و جەماعەت بەتاییەت داواکراون بۆ ئەوەی هەلّسن بە فەرمان بە چاکەو نەهی لە خراپە بیّئەوەی چاوەڕوانی شتیّك بکەن لە دەورو بەرەکەیان.

ئەگەر بیّت و ئەهلی سوننەت و جەماعەت پشتیوانی لە زاناکانیان بکەن

و نرخیان بزانین و دەوریان بدەن، ئەوا بە چاکی دەتوانن فەرمان بە چاکە و نەهی لە خراپە بکەن.

جێگای داخە کەوا ئەهلی بیدعەت بە پێچەوانەوە زۆر شێخ و مەلاکانی خۆیان بە بەرزو پیرۆز دەزانن لە رادەبەدەر گەورەیان دەکەن، چونکە شێخ و مەلاکـانی ئەهـلی بیدەعەت و کۆمەڵە گومراکانی تر پیاوانی خۆیان وا پەروەدە دەکەن کە بەم جۆرە حورمەتیان بگرن.

. ئەهلی سوننەت زۆر لەوان شایان ترن کە حورمەتی زاناو پێشەوایان خۆیان بگرن، ئەبێ چ خێرێك بەو گەلەوە هەبێ کە گەورەکانی بەزەیی بە بچووکەکانی نەیەتەوەو بچووکەکانیشی رێزی گەورەکانیان نەگرن!

بێ فیزی و سادەیی گەنجی موسڵمانی بانگەوازیکار لەوەدایە نرخی خۆی بزانێ مل ملانێ نەکات لەگەڵ ئەم زاناو ئەو زانا، یا بڵێ: جا ئەوان پیاون و ئێمەش پیاوین!!

لە راستیـدا پیاوەتیش جۆری هەیە.. لە پیاواندا هەیە زاناو دانا... تیاشیاندا هەن خواناس و لە خواترس... هەیانە ئازاو بەجەرگ .... تاد.، وە بە پێچەوانەی ئەمانەش هەن! هەروەکو ووتراوە:

عارد لە کوێو... ئاسمان لە کوێ؟!

دەبینـین یەکێکیـان هێشتـا هەر قوتـابیـەو لەوانەیە چەند ئایەتێکی قورئـانـی لە بەر نەبێت و کەمتـرین زانیـاری دەربـارەی قورئـان و فەرموودەکانی پێغەمبەر نەبێت کەچی مل ملانێی زانایان دەکات وەکو ئەوەی خۆی بەشافعی و ئەبو حەنیفە بزانێ، کەقسەش دەکات دەڵێ:

من رام وایە،
ئێمە وای بۆ دەچین
من وام ووتوە،
بەلای منەوە وایە!!

يقولون هذا عندنا غير جائز!!
ومن انتم حتى يكون لكم «عند»!

بێ فیزی و مل کەچی موسڵمان لەوە دایە خۆی بە گەورەتر نەزانێ لە هاوەڵەکانی، گەلی جار مرۆڤ مل ملانێو پێشبڕکێ لەگەڵ دۆست و هاوڕێکانی دەکات وا هەوڵ دەدات لە نرخیان کەم کاتەوە عەیبدار یان بکات یا هەڵەکانیان لەسەر گەورە بکات، وەبە ڕواڵەت ناوی ئامۆژگاری کردن و رەخنە لێ گرتن و راست کردنەوەی لێ دەنێت سەیرە! بانگەوازیکارێك بە کۆڕێکی ئاینی هەزاریان دوو هەزار کەسی تووڕەو نارەحەت دەبێ، بەلام ئەگەر لە ئاهەنگێکی گۆرانی یا وەرزشیدا بیست هەزار یان سی هەزار کەسی ئامادە بێت چ باس نیە! بەڕاستی ئەمە غەریب حاڵیە، بەستەزمانیە!

ئەگەر برایەکی بانگەوازیکار هەندێ تێبینی لەسەر هەبێت، بەلام ئەوەندە بەسە کە ئەو برایە خەڵکی بۆلای خوا بانگ دەکات و خەڵکی فێری ئیسلام دەکات

ومن ذا الذي ترضى سجاياه كلها؟
كفى المرء نبلاً ان تعدّ مصايبه.

بێ فیزی و بێ لاف و گەزاف ئەوەیە تۆ بە چاوی سووك تەماشای ئەو کەسەنە نەکەی کە لە تەمەندا یا لە تواناو دەسەلاتدا یا لە زانین و زانیاری دا لە تۆ نزمترە، خۆت لەو کەسە بەزل تر نەزانی، کێ دەڵێ لە من و لە تۆ دل پاکترو بێ گوناهتر نیە، و لە خوا نزیك تر نیە؟!

ئەگەر هات و کەسێکی گوناهکاریشت دی تۆ خۆت لەو بە گەورەترو زل تر مەزانە، سووپاسی خوا بکە تۆش بەدەردی ئەو نەچووی! ئەوەش بێنە بەرچاوت ئەگەر خوانە خواستە ریابازی یا ناز و فیزێك کەوتە نێو کارەکانتەوە ، هەمووی بە فیڕۆ دەچێت، دوور نیە ئەوکەسەش هەست بە

تاوانـەکـانی بکات وپەشیمان ببێتەوە بە جۆرێکی وا کە خوای گەورەش لەگشت تاوانەکانی خۆش ببێ!

عن جندب (رض) ان رسول الله ﷺ قال:

«ان رجلاً قال: والله لا يغفر الله الفلان، وانّ الله تعالىٰ قال: من الذي يتألّي عليّ أن لا اغفر لفلان؟ فأنّي قد غفرت لفلان وا حبطتُ عملك»[1]

واته:

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: پیاوێك ووتی ولاهی خوا قەت لەفلانەكەس خۆش نابێت، خوای گەورەش فەرمووی: ئەوە كێیە خوایەتی بەسەر منەوە دەكات كە من لە فلانەكەس خۆش نابم؟ ئەوە من لە فلان خۆش بووم و كردەوەی ئەوی تریشم قەبوول نەكرد.

جا نابێ لاف و گەزاف لەسەر ئەو جۆرە كەسانە لێ بدرێت، لەوانەیە تۆ بەتەواوی شارەزایی نەبووبێ، لەوانەیە كابرا كاری وای بۆ خوا كردبێ ئێمە نەمـامكردووە، یا لەوانەیە ئێمە جۆرە گوناهێكمان كردووە كە ئەو نەیكـردووە، دوورنیە ئەگەر لەگەڵیدا بەسۆز و دڵ نەرم بین زیاتر قسەو ئامۆژگاریەكان بهێنە گوێیەكەیەوە.

نابێ كردەوەكـانی خۆت ئەوەنـدە لا گەورەبێ‌و شانازی پێوە بكەی، ئەگەر هەر چاكەو خواپەرستیەكت ئەنجام دا ترسی ئەوەت هەبێت كە خوا وەری نەگرتبێ، خوای گەورە دەفەرموێت:

«انما يتقبل الله من المتقين» (المائدة: ٢٧)

بێ گومـان خوای گەورە كاری ئەو كەسانە وەردەگرێت كە لە خوای گەورە دەترسن و پارێز دەكەن، بۆیە هەندێك پێشینەكانمان ووتوویانە:

ئەگـەر بزانم خوای گەورە یەك تەسبیحاتی لێ قەبوول كردووم. هەر ئێستا داوای مردن دەكەم!

---

(١) (موسلیم) ریوایەتی كردووە.

خۆ بەزل نەزانین ئەوەیە کە یەکێك ئامۆژگاریەکت دەکات شەیتان وات لێ نەکات وەری نەگری و گومانی خراپ بە موسڵمانەکە ببەی ئامۆژگاری کردن ئەوەیە کە برایەك هەڵەکانت بۆ راست بکاتەوەو بیخاتەوە بەرچاوت، بە پێچەوانەوە مرۆڤی لە خوا ترس ئەبێ کە یەکێك هەڵەکانی بۆ راست کردەوە بەدڵێکی خۆشەوە وەری بگرێت و سوپاسی ئەو کەسەش بکات لە پاداشتی ئەم دڵسۆزیە، خۆبەکەم زانین و مل کەچی بەم شێوەیە دێتە جێ بۆیە دەبینین پێغەمبەر ﷺ لە پێناسەی خۆ بەزل زانی فەرموویەتی:

«بریتی‌یە لە گوێ نەدان بە هەق و بە سووك سەیر کردنی خەڵکی»[1]

مرۆڤی لووت بەرز، بەلاف و گەزاف؛ خاوەنی دەروونێکی زلە، بە هیچ جۆرێـك بە چاکە ناوی کەس نابات، ئەگەر هەر باسی موسڵمانێکیشی لا بکرێت ئەوە تەنها پەردە لەسەر هەڵەو کەم و کوریەکانی لادەباو بەبای دەکا، ئەگەر یەکێك بیەوێ ئامۆژگاری ئەو جۆرە مرۆڤە لووت بەرزانە بکات یا هەڵەیەکی بۆ راست بکاتەوە، ئەوە هەر مەپرسە چ قیامەتێکی لێدادێت! وە بەرچاوی تاریك دەبێت وەکو ئەوەی کوفر کرابێت، چونکە هەست بەکەم و کوری دەکات لە زاتی خۆیدا.

مرۆڤی پێ گەیشتوو نابێت بەرەخنە لێگیران و ئامۆژگاری کردن قەلس بێت یا شەرم لە خۆی بکـاتـەوە یا توورەبێ، ئێمە ئەبێ ئەو دروشمەی پێشەوا عومەری کوری خەتتاب (ر.خ) بەرز بکەنیەوەو بڵێین:ـ رحم الله امرئ اهدیٰ الینا عیوبنا.

---

(١) (موسلیم، ترمزی، ئەبوداود) ریوایەتیان کردووە.

# چوارەم: دادگەری «العدل»

دادگەری راگرتنی تەرازووە لە نێوەراستی لە هەموو کارو بارێك دا، ئەمەش سیمای موسلمانانە، سیمای ئەهلی سوننەت و جەماعەتە لەهەموو کاروبارێکدا، واتە هەموو خاوەن مافێك نرخ و مافی خۆی پێ بدرێت، لەبەر ئەوەی کەدادگەری بواری زۆرن، لێرەدا هەر ئەم چەندبوارەی دەخەینە بەر چاو:-

## ا- دادگەری لەگەڵ دۆست و دوژمندا:-

زۆر کەس ئەگەر باسی دۆستێکی یان خۆشە ویستێکی لەلا بکرێت، بەباڵ و شانیدا هەڵ دەدا و بەرزی دەکاتەوەو کەم کورییەکانی دادە پۆشێت ئەگەر بشزانێ شایانی مەدح نی‌یە، بەڵام ئەگەر باسی ناحەزێکی لەلا بکرێت بەخراپە ناوی دەبات و هەر چی هەڵەوکەم کوری هەیە باس ئەکات بێ ئەوە چاکەکانی بڵێ: ئەگەر چی دەشزانێ وانی‌یە.

ئایا بانگەوازیار دەتوانێ کەم وکوریی‌یەکانی نزیکێترین کەس لە خۆی کە لەسەر یەك پەیرەولە یەك سەنگە ردایە باس بکات؟!

ئایا دەتوانێ بەچاکە یابەراستگۆیی باسی کەسێك بکات کە لەگەڵیدا لە چەند بایرو بۆ جونێك دایەکتر ناگرنەوە؟!

ئەگەر توانێ ئەو کارەبکات ئەوا دادگەری نواندوە لەم بوارەدا، جێگای دڵخۆشیە، بەڵام بەداخەوە زۆر کەس ئەمرۆ ستەم لە ناحەزانیان دەکەن بە جۆرێك باسیان دەکەن کەدوورە لەراستی، وەستەم لە خۆشەویستەکانی خۆشیان دەکەن بە جۆرێك مەدحیان دەکەن کە لێیان

نایەت.. ئەمەش ستەمە، تاوانە چونکە ووتراوە (فمن اثنىٰ عليك بما ليس فيك فقد ذمك) هەر کەسێ بە زۆر مەدحی کردی ئەوە بەخراپی ناوی بردووی.

خوای گەورە فەرمـانمـان پێ دەکـات کە دادگەری بنوێنین بالەگەل دوژمنیشمان بێت. دەفەرموێ:ـ

«ولا يجرمنكم شنآن قوم علىٰ ألّا تعدلوا، اعدلو هو اقرب للتقوىٰ» (المائده.....٨)

زۆر جێگـای داخ و خەفـەتە ئێمە بەقسەمل کەچین بۆ فەرمانەکانی قورئان، بەڵام هەر زوو بە زوو ئەم دەرسنەمان لەیاد دەچێت و ناکەوێتە چوار چێوەی کارو کردەوەکانمانەوە، دەبینی موسلمانێك هەڵەیەکی لێ روو دەدات ئەو بە ستـەمـانە یەکسەر حیسابی سفری بۆ دەکرێت وکەس بەلایەوە ناچێت زۆر جار وادەبێت چاکە زۆرەکانی موسلمانێك نابینین لە بەر چەند هەڵەو پەلەیەکی کەم، وەیا هەڵە زۆرەکانی نابینین لەبەر چەند چاکەیەکی کەمی.

نەخێر... بەم جۆرە نابێت!

مەسەلەکە زۆر لەوە گەورە ترە! لەبەر جەند هەڵەیەك چاکە زۆرەکانمان لە یاد بچێ نابێ ئەم بنچینە شەرعیە لەیاد بکەین کە دەڵێ:ـ

«اذا كان الماء قلتين لم يحمل الخبث»[1]

بەڵی ئاوی زۆر پیسی کەم بەخۆیەوە هەڵناگرێ بەڵکو لە خۆیدا بزری دەکات.

## ب ـ دادگەری لە هەڵسەنگاندنی کتێبان:ـ

کاتێ کە کتێبێکت دەکەوێتە بەر دەست راست نیەو دادپەروەری نیە بڵێی ئەوە هیــچ نیەو بۆ خوێندنەوە دەست نادات، بۆچی؟ جا یا لەبەر

(١) (ئەحمەدو، ئیبنوماجەو، ئەبوداودو، نەسائی) ریوایەتیان کردووە.

ئەوەیە کە چەند فەرموودەیەکی لاوازی تێدایە یان چەند راو بۆ چوونێکی نامۆی تێدا بەدی دەکرێت، بەڵام ئەمانەش نابن بە بەڵگەئەی بۆچی نایەی باسی لایەنە چاك و بەسوودەکەی ئەم کتێبە بکەی؟ کە بریتین لە رێمنونی و ئامۆژگاری پرسوودو لێکولینەوەی بەهێز وەدەبێ ئەوەش بزانین کەوتنی نیوەی راستیو پشتگوێ خستنی نیوەکەی تری بە دادگەری ناژمێررێت بەڵکو تاوان ستەمە.

گەلی کەس کە هەڵەیەك لە کتێبێکدا دەبینن خۆلەم نووسراوە دەپارێزن و خەڵکی تریشی لێ دوور دەخەنەوە، هەرچی نووسراوو پەرتووکی زاناکان هەیە ئەگەر بەم چاوە سەیری بکرێو بەم تەرازوە پێوانە بکرێ باوەر ناکەم یەکێکی لێ دەربچێ!!

باسەیری (صحیح النجاری) بکەین کە راست ترین پەرتووکە دوای قورئانی پیرۆز ئایا دەتوانین بلێین ئەمیشیان وەکو قورئان بێ کەم کوری‌یە؟ بێ گومان، نەخێر.. ئەویش لە هەندێ بابەت و فەرموودەو سەرچاوەی وەرگێرانی فەرموودەکان بۆ چوونی جیا جیای لەسەر هەیە.

بێجگە لە قورئانی پیرۆز هیچ پەراوێکی تر بێ کەم و کوری هەڵە نیە، جا نابێ ئێمە لایەن ناتەواوی پەراوێك باس بکەین و لایەنی چاك و تەواویش پشت گوێ بخەین.

## ج ـ دادگەری لەحوکم دان بەسەر بانگەوازیو بزووتنەوە ئیسلامیە کاندا:ـ

پاش رووخانی خەلافەتی ئیسلامی لە جیهانی ئیسلامیدا گەلێك بانگ و بزوتنەوەی ئیسلامی سەری هەڵدا، بەمە بەستی گێرانەوەو زیندوو کردنەوەی ئیسلام لە دڵ و دەروون و لە واقعی ژیان دا، هەروهابەمە بەستی بەردەوام بوونی بانگەواز لە نێو گەلانی نامسوڵمانی جیهاندا، جا

بەمــەبــەستیی زینــدوو کردنــەوەی سوننەتی پێغەمبەر -ﷺ- یاهەر ئامانجێکی تر لە ئامانجە پیرۆزەکانی ئیسلامدا.

جا ئەم بزووتنەوەی ئیسلامی‌یانە جیاوازیان هەبووە لەپەیڕەوی ئیش کردن وبنچینــەدە ئامانجەکانیاندا لەگەڵ جیاوازی لەدووروو نزیکیان لە قورئان و سوننەتی پێغەمبەر -ﷺ- گەلێك لە نووسەران لێکۆڵینەوەی جیاجیایان دەربارەی ئەم بانگ بزووتنەوانە نووسیوەو پێش کەش کردووە کردووە، بەڵام زۆر لەم لێکۆڵینەوانە دوورن لەدادپەروەری، هەندێك لەو نووسەرانەی کەسەر بە کۆمەڵێکی دیاری کراون تەنها پەیڕەو پرۆگرامی ئەو گرووپە پەسند دەکەن و شانازی پێوە دەکەن، هەندێکی تر کە سەر بە هەمان کۆمەڵ نین کەم و کوڕی‌یەکانی لێ گەورە دەکەن و دەیخەنە ڕوو بێ ئەوەی لایەنە چاکەکانی ئەم کۆمەڵە باس بکەن، جالەم بەینە هەقیقەت و ڕاستی یەکەت لێ وون دەبێت و نایدۆزی‌یەوە!

خوای گەورە حەز لەداد پەروەری دەکات رقی لە زوڵم و ستەمە بۆ ئەبێ چەند کەم و کوڕی یەك ئەو هەموو چاکی و پاکی یەمان لەبیر بباتەوە؟!

هەندێ جار بەر گوێمان دەکەوێت کە باسی کۆمەڵە موسلمانێك دەکرێت وەك ئەوەی کە باسی کۆمەڵە شەیتانێکت بۆ بکەن شایەتمانیەکەیان ئەخەنە گومانەو کردەوەکانیان ئەخەنە گومانەوە، ئەم جۆرە حوکم دانە هەڵەیەکی گەورەیــە چونکــە کەسێ بیەوێ خۆی لەم جۆرە بابەتانە بدات پێویستە .ووردو درشتی مەسەلەکان بخاتە روو، ئاگای لە قسەکانی خۆی هەبێت چاکەو خراپەکان بەیەکەوە باس بکات.

پێشەواو زانایانی ئەهلی سوننەت و جەماعەت کەباسی ئەهلی بیدعەتیان ئەکـرد، کۆمــەیــان دەکردن و خراپیەکانیان ئەخستنەروو وەخەلکیان لێ ئاگــادار دەکــردنــەوە، بەڵام لەگــەڵ ئەوەشــدا باسی چاکــە و مەردایــە تیەکانیشیان دەکردن، وەکو- بەر بەرەکانی کردنیان لەگەڵ خوانە ناس و

دوژمنانی ئیسلام یالەبەرپەرچ دانەوەی هیرشی هیزەکانی کوفر بۆ سەر موسلمانان، یا مسلمان کردنی کافران، ئەگەر چی دەیانکردن بە موسلمانی بیدعەچی بەلام هەر چاکترە لەوەی کە هەر لەسەر کوفرەکەیان بمێننەوە. دادپەروەری لەوەدایە کە بیدعەکانیان دانەپۆشین لەبەر ئەوەی چەند کارێکی چاکیان هەیە، یا چاکەکانیان دانەپۆشین لە بەر ئەوەی چەند بیدعەیێکیان هەیە.

## د) دادگەری لە تێروانین بۆ هەوڵ و کار لە بواری بانگەوازیدا:-

چەندەها هەوڵ وتێکۆشان هەیە لە مەیدانی دەعوەو بانگەوازیکردندا بۆلای خوابێ ئەوەی سەر بەهیچ دەستەو گروپێك بن، بۆ ئەم کارە جیهادی وخوا ویستانەیە چەندەها موسلمان بازوویان لێی هەلمالیوە. جا ئەم کارە لەوانەیە زۆر بەراست و دروستی ئەنجام بدرێت یان هەندێ هەلەی تێ بکەوێ هەلسەنگاندنی ئەم جۆرە چالاکی یانە بەشێوەیەکی راست و دادگەرانە دەبێتە هۆیەك بۆ گەشەپێکردن و بەرەو پێش بردنی لایەنە ئیجابیەکانی و سوود لێ وەرگرتنی زیاتر، بە هەمان شێوە نەهێشتن و بن بڕ کردنی کەم و وکوریەکان و دووبارە نەبوونەوەیان.

بەلام ئەگەر هاتوو هەندێك ئەوکارە زۆر بەرێك و دروست بزانن رێگای هیچ کەس نەدەن کە رەخنەیەك بگرێت و تێبینیەك بخەنە روو، وەهەندێکی تر بەس باسی عەیب و هەلەکانیان بکەن و بە چاوێکی سووك وبێ هوودە سەیری کارەکان بکەن، ئەوا لەو نێوانەدا سوودو بەرژەوەندیەکان لە دەست دەچن!

وەکو نموونەیەك جیها دی ئەفغانی.. جیهادی زیاتر لە (دە) ساڵ ئارەقەو خوێن و فرمێسك (دە) ساڵی بێ ووچان لە قوربانیو شەو نخوونی و ئازارو ئەشکەنجەه

لەلایـەك هەندێك وا سەیریَ ئەم جیهادە دەكەن كە هیچ جۆرە كەم وكـوریەكی نیەو هەمان جیهادی سەحابەكانی پێغەمبەر -ﷺ- بۆیە بەلایانەوە هیچ رەخنەو تێبینی بەخۆوە هەلناگرێت.

لە بەرامبـەر ئەوانیشـدا هەنـدێكی تری ووشك هەن كە باسی موجا هیدانی ئەفغان دەكەن بە نەفام و بیدعەچی ناویان دەبەن! بە بیا نووی ئەوەی گوایـا نووشتی وكشتـەك بەكـاردێنن یا بیـدعـە لە هەنـدی لە مزگەوتەكانیان دەبینریَ! بگرە كار لەوەش تیپەڕیوە یەكێك پێ یان دەڵێ:- «هؤلاء مشركين يحاربون ملحدين!!» ئەم ئەفغانیانە موشریكن دژی بێ باوەڕو كۆمەیستەكان دەجەنگن!!

یەكێكی تر دەربـارەی كۆمـەڵێكی سەلەفی ی‌ەفغـانی نووسیویەتی و دەڵێ:- هەر كەسێـك بەكـافریان نەزانێ خۆیشی كافرە، جا ئەگەر ئەمە دەرهەق بە كۆمەڵێكی سەلەفی وابڵێ دەبێ چی بەوانی تر بڵێ؟! هەر خودا پشت و پەنامان بێت كوا ئەو تەرازووە راستەی كە خوای گەورە بۆ ئەم ئوممەتەی داناوە؟ ئائەمەیە شوێن كەوتنی پێغەمبەر -ﷺ-؟

ئەو پێغـەمبـەرەی كە نرخی هەمـوو كەسێكی زانیوەو بەچاوی كەم تەمـاشـای كاری هیـچ كەسێكی نەكردووە؟ قەدری چاكەكانی خەڵكی گرتووە ئەگەر كەم كورتیشی تیادا بووبێ!

ئەوەتا كە وەسفی (نەجاشی) دەكات دەفەرمووێ: «ملك لايظلم عنده احد[1] » واتە پاشایەكە هیچ كەسێك لای ئەو ستەمی لێ ناكرێت، لەگەڵ ئەوەش هێشتا موسلمان نەبوو بوو.

لێرەدا هەندێك لە بانگەوازیكاران هەن تەنها بە یەك چاو سەیری شت دەكـەن، یابە چاوێكی رەزامەندی و گوێ نەدان بە هەڵەكان، یابەوێكی نارەزایی كە بێجگە لە خەوش و خراپە هیچی تر نابینن:-

---

(١) [احمد و بەیهقی] ریوایەتیان كردووە.

وعين الرضا عن كل عيب كليلة

ولكن عين السخط تبدي المساويا

إذا كان المحبُ قليل حَظٍ .

فما حسناته إلا عيوب!

پێویستــه لەســەربــانگــەوازیکــاران کە دەست بەو ئەحکامانەوە بگرن کەفــێرمــان دەکــەن تەرازووەکــە لە ناوە راستــەوە بگــرین و بەچاوێکی دادپەروەرانەوە سەیر بکەین تا نەکەوینە ژێر کاریگەری هەست و سۆزەوە جاچ بۆ چاکە بێ یان بۆ خراپە «ولا یجرمنکم شنان قوم علی الا تعدلوا، اعدلوا هو اقرب للتقوی» (المائده ـ ٨)

## (هـ) دادگەری لە مامەڵە کردن لەگەڵ دەقەشەرعیە کاندا.

ئەو دەقانەی کە موحکە من و روون و ئاشکران کاکڵەی (ئایینەکەی خوا) پێك دەهێنن بروا پێ هێنان و دەست پێوەگرتن و ئەنجام دانی ئەرکەو پێویستی سەرشــانی گشت موسلمــانێکــە مەگــەر ئەو ئەحکامانەی لێ دەرچێت کە کاریان پێ ناکرێت لەوەگرتنی ئەو دەقانە، ناکرێ هەندیکیان وەرگری هەندیکیان پشت گوێ بخرێن ورابگیرێن بەتایبەتی ئەو دەقانەی لەسەر یەك بابەت دەروّن یا دوو بابەتی بەرامبەر یەکتری هەندێك تەنها ئەو دەقــانــە وەردەگرن کە هەرەشەو ترساندنی تیادا هاتووە وەکو ئەو فەرمــوودانــەی دەفەرموون: «لایدخل الجنه قاطع»[١] هەر کەس سیلەی رەحمی بپچرێنێ و سەر لەکەس کاری نەدات ناچێتە بە هەشت.

---

(١) (بوخاری، موسلم، ئەبوداود) ریوایەتیان کردووە.

یا ئەو فەرموودەیەی دەفەرموێ:

«لایدخل الجنه قتات[1]» ناچێتە بە هەشت ئەو کەسەی دووزوبان بێت واتە نەمیمی لە نێوان خەڵکی دا بکات.

«کفر بالمرء تبرؤ من نسب وران دق»

(نکوڵی کردن لە نەسەب ئەگەر فرمیش بێت، کوفرە!)

بەهـۆی ئەو دەکـانـەوە هەنـدێك بەم کاروکردەوانە موسڵمانان کافر دەکەن، ئەوەش ڕاست نی‌یە چونکە وەرگرتنی فەرموودەکان بەرووالەت مەبەستی ڕاستە قینەی ئەم فەرموودانە دەرناخەن، بەڵکو ئەبی ئاگاداری ئەوە بین چەنـدەهـا فەرموودەی تر هەن کەیارمەتیمان دەدەن لە لیکدا نەوەی فەرموودەکانی پێشوو وەحوکم دان بەسەریاندا، وەکو:ـ

«فان الله حرم علی النار من قال لا اله الا الله یبتغی بذلك وجه الله[2]»

خوای گەورە ئاگری لەو کەسە حەرام کردووە کە بڵێ هیچ خوایەك نیە بێجگە لە «الله» وەلە دڵەوە مەبەستەکەشی شی ڕازی کردنی خوابێ

«منْ شهد ان لا اله الا الله وان محمدا عبده ورسوله وان عیسٰی عبد الله ورسوله، وکلمته القاها الٰی مریم وروح منه، وان الجنه حق وان النار حق أدخله الله الجنه علی ما کان من العمل[3]»

هەر کەسێ شایەتمانی بهێنێ کە هیچ خوا یەك نیە بێجگە لە «الله»وە موحـەمـەد بەنـدەو رەوانە کراوی خودایەو عیسا بەندەو ڕاوانەکراوی خودایـە کە دای بەمەریەم وەگیانیکە لەلایەن خواوە پێی بەخشراوە. و شاهیێدی بدات کە بەهـەشت هەقەو دۆزەخ هەقە ئەوا خوا دەیباتە بە هەشت جا کارو کردەوەی هەر چۆن بێت

(١) (بوخاری، موسلیم، ئەبوداود، ترمزی)ریوایەتیان کردووە.

(٢) (بوخاری و موسلیم) ریوایەتیان کردووە.

(٣) (ئەحمەد، بوخاری، موسلیم، ترمزی) ریوایەتیان کردووە.

که سانیکی تر هەن بەپێچەوانە تەماشای مەسەلەکە دەکەن، تەنها ئەو دەقانە یان لا گرنگ و بە پێویستیان دەزانی کە مزگێنی دەرن و دل. خۆش کەرن، وا لە خەلکی دەکەن کە بێ غەم بن و لێی پال. بدەنەوەو هیچ نەکەن وەك ئەوەی بە هەشتیان مسوگەر بێت، وە هەرچی ئەو دەقانەی کە ترس و هەرە شەی یان تێدایە پشت گوێ دەخەن! هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێ:ـ

«فخلف من بعدهم خلق، ورثوا الكتاب ياخذون عرض هذا الادنى ويقولون سيغفر لنا وان ياتهم عرض مثله ياخذوه» (الاعراف:ـ ١٦٩)

واتە: پاش ئەوانە وەچەیەکی ترهاتن و بوونە میراتگری کتێبی خوا و لەهەمان کاتیشدا دونیا ویستن ودین فرۆشن و دەشلێن دەی دەی خوا هەر لێمان خۆش دەبێت و ئەگەر بۆ شیان بلوێ دیسان دین دەفرۆشنەوە بەدوینا»

راستیەکەی ئەوەیە گشت لایەنەکانی بە توندیو تەواوی وەربگیرێ تاوەکو تەرازووەکە بە پارسەنگی بمێنێتەوە.

راستیو دادگەری ئەوەیە تۆ هاوسەنگی رابگری لە نێوان مەسەلە سەرەکی یەکان و مەسەلە لاوەکییەکان دا، چونکە ئەم ئایینە هەمووی ئایینی خودایە، هیچ بەشێکی ئەم ئایینە ماوەی ئەوەی تێدانیە بە سووك سەیر بکرێ یا پشت گوێ بخرێ، بۆیە پێغەمبەری خوا -(ﷺ)- لەوکاتەی کە جوبرەئیل پرسیاری لێ کرد دەربارەی پێناس «ئیمان و ئیسلام و ئیحسان» لەپاشا فەرمووی: «هذا جبرل اتاكم يعلمكم دينكم»[1] ئەوە جوبرەئیل بوو هاتبو (ئاین)ە کەتان فێر بکات کە وابوو ئیمان ئیسلام و ئیحسان بە هەموویانەوە ئایین تەواو دەکەن.

---

(١) البوخاري موسليم، ئەبوداور، نەسائی) ریوایەتیان کردووە.

جا ئەگەر کە سێك باوەڕی نەبێت بە بەشێکی ئەم ئایینە کە دەقی قورئانی لەسەر هاتبێت یان بەسوننەتێکی پێغەمبەر چەسپا بێت، ئەو کەسە کافر دەبێت جا با ئەو مەسەلەیەی کە بڕوای پێ نیە (سوننە) تێك بێ یا (فرض کفایە)یە یەك بێت وەکو دوورکات نوێژی بەرەبەیان یا بانگ دان یا.... هەر مەسەلەیەکی تر لەم جۆرە.

لە ئیسلام توێکل یان بابەت ومەسەلەی پووچ و بێ هوودە نیە، هەر وەکو هەندێك نەفام و هەڵپەچی وابۆ خۆیان خۆش دەکەن بێ ئەوەی هیچ زانیاریەکیان هەبێ.

بەڵکو ئیسلام چەندەها پلەو پایەی تێدایە هەندێك کارلە هەندێك خێر تر و گەورە ترە، هەهەندێك لە هەندێك تر گونا هترەو تاوانەکەی زل ترە، هەندێ مەسەلە لەپێش هەندیکی ترەوە دێن، وەکو بایەخ دان بە (عقیدة) بیروباوەر بەر لە لە هەموو مەسەلەیەکی تر، وە هاتنی هەندێ بابەتی سەرەکی گرنگ لەپێش بابەتی تر کە گرنگیەکەی کەمترە، کاتێ کە هەڵەو نەنگی لە مرۆڤێك بەدی دەکەی دانایی ئەوەیە لە پێشدا ئەو هەڵانەی بۆ راست بکرێتەوە کە گەورەو ترسناکن قەت ئەوە دەبێ مل بگری و پێ بڵێی کابرا تۆ بۆ فلانەزێکری سوننەت ناکەی؟! لە کاتێکدا هێشتا نوێژە فەرزە کاتی بەتەواوی ناکات ! یا دەبێ تو جگەرە کێشان لە یەکێك قەدەغە بکەی لە کاتێکدا هێشتا بیروباوەرەکەی پاك نەبۆتەوە؟!

پلە پلەی (التدرج) لە بانگەوازیکردندا زۆر پێویستە، هەر وەکو لەم ئامۆژگاریەی پێغەمبەر -ﷺ- بو (معاذ) ئەو راستیەمان بۆ روون دەبێتەوە کاتێ کە ناردی بۆ یەمەن، پێ فەرموو:

«إنَّك تأتي قوماً اهل كتاب فليكن اوّل ماتدعوهم اليه شهادة أن لا إله الاّ الله وأنّ محمداً رسول الله، فأن هم أطاعوا لذلك فأعلمهم أن الله

افتــرض عليهم خمس صلوات في كل يوم وليلة، فأن هم اطاعــوا لذلك فاعلمهم ان الله افترض عليهم صدقه تؤخذ من اغنياءهم فترد على فقراءهم....»[1]

واتــه:ـ ئەی معاذ تۆ دەچیە نێوگەلێك كە ئەهلی ئاینە ئاسمانیەكانی ترن، یەكەمین شتێك كە بانگی بۆ دەكەی شایە دمانیو بیرو باوەرە بە تاك و تەنهایی خوای گەورەو راستێتی پێغەمبەر ایەتی محمد ـ﴿ﷺ﴾ـ ئەگەر ئەوەیان وەرگرت ئینجا پێ یان رابگەیەنە كە خوای گەورە لەشەوو رۆژێكدا پێنج نوێژی لەسەر داناون، ئەگەر ئەویشیان بەجێ هێنا پێیان رابگەیەنە كە خوای گەورە زەكــاتێكی لە سەر دانــاون كە لەدەولەمــەنــدەكــانی موسلمانان وەردەگیرێو بەسەر هەژارەكانیان دابەش دەكرێت.

پێش خستنی كارە گرنگــەكان بەپێش كاروباری تر لە كاتی دەعوەو بانگــەوازیكــردندا، ریبازی پێغەمبەری خوا بووە ـ﴿ﷺ﴾ـ بەشێكە لە سوننەت و بەرنامەی كاری پێغەمبەر ـ﴿ﷺ﴾ـ لە بانگەوازیكردن و بلاو كردنەوەی پەیامی خوای گەورە هەروەها بەشێكە لە وەسیەتەكەی بۆ یارە بەرێزەكانی.

هەنــدێ موسلمانی دلسۆزو خواویست هەن مەسەلە بچووكەكان بە توندی دەگرن و زۆر ترین بایەخی پێ دەدەن بەڵی هەمووی هەر گرنگە بەلام گرنگ و گرنگ ترو گرنگرینیش هەن، كە سیش ناتوانی بڵی باواز لەو مەســەلانــە بهێنین نەخێر! بەلكو ئەبێ مەسەلە بچووكەكان لە شوێنی شیاوی خۆی دابنرێو مەسەلە گرنگە كانیش لە شوێنی شیاوی خۆیان.

---

(١) بوخاري، موسلیم، ئەبوداود، ترمزی، نەسائی) ریوایەتیان كردووە.

رۆژێك لەوانەیەكی (بلوغ المرام)دا كە بۆ قوتابیەكانم باس دەكرد ئەو فەرمـوودەیـەم هێنایەوە كە لە (ئەبی سەعید) رەزامەندی خوای لەسەر بێت، وەرگیراوە كە دەفەرموێ: «إذا أتى احدكم المسجد فلينظر في نعليه، فأن رأى فيهما أذى فليمسحه وليصل فيهما»[1]

واتـە: ئەگەر یەكێكیان هاتن بۆ مزگەوت باسەیری پێلاوەكانی بكات ئەگەر شتێكی پیسی پیوە بووبا پاكی بكاتەوەو نوێژی پێوە بكات، منیش ئەوەم بە هەل زانی بۆ روون كردنـەوەی ریبـازی تەواو لە چونیـەتی تیگەیشتنی ئەم جۆرە فەرموودانە، هەر وەكو لەم چەند خالەدا.

یەكـەم:ـ ئەو سوننـەتانەی كە لە پێغەمبەر ـ﴿ﷺ﴾ـ وەرگیراوە لەم بارەیـەوە كە ئەمیش لە پێنـج فەرمـوودەدا خستومەتە ڕ.وو[1] كەگشتیان سەرچاوە كانیان بەهێزن و جیگای باوەڕ.ن، ئینجا لە دووەم خالدا راو بۆ چوونی زانـایانم [2] هێناوەتەوە، كە لە سێ خالدا كورتم كردەوە جالەدوا خالدا بەهێـز ترین راو بۆ چوونم خستـوتـە ڕ.وو كە بەلگـەی روون و گەشەداری لەسەر هاتووە، ئەویش ئەوەیە كەوا باشترە «مستحب»ە نوێژ لە پێلاودا بكرێت لەگەل. لەبەر چاو گرتنی ئەو خالانەی خوارەوە:ـ

أـ بە چاكی سەیری پێلاوەكە بكرێ و لە پاك وخاوێنی یەكەی دلنیا بیت هەروەكو لە فەرموودەی ئەبی سەعید وەرگیراوە.

---

(١) (ئەبو داود) ریوایەتی كردووە.

---

(١) تێبینی:ـ دانەر دەقی هەر پێنج فەرموودەكانی هێناوەتەوە بەلاّم بە پێویستم نەزانی ئەوەندە بەدوورو درێژی لێرەدا بینوسینەوە.

(٢) بە هەمان شێوە نووسینەوەی ئەوسێ راو بۆ چوونەشم بە پێویست نەزانی كە بنووسرێتەوە.

وەرگێڕ

ب) بەهـۆی ئەم کارە هیچ قرەو هەرایەك دروست نەبێت باوای لێ بێت دەنگ و هەرا بکـەویتە نێو مزگەوتەکان یا ببێتە هۆی رق وقین و دابڕ. دابـڕ.ی نیـوان موسلمانان،بێ گومان ئەم جۆرە هەلویستانە دوژمنانی ئیسلام دەیقۆزنەوەو پێ‌ی دلخۆش دەبن.

ج) پێویستە مەسەلەو بابەتە گرنگەکان لە پێش ئەوانی ترەوە حیسابیان بۆ بکرێت، پێویستە ئێمە لەسەرەتادا مەسەلەی بیرو باوەڕ.ی (عقیدة)ی خەلك راست بکەینەوە، خەلکی لە جۆرەکانی هاوەل. پەیدا کردن بۆ خوا (الشرك بالله) ئاگاداری بکە ینەوە، وەها نیان بدەین کە ئەرك و واجباتەکان جێ یەجێ بکەن و لەشتە حەرام کراوەکان دوور بکەونەوە، هەروەها هانیان بدەین پابەندبن بە سوننەت وکاری چاك وە لە کاری ناهەموار خۆ بە دوور بگرن خۆ نابێ ئێمە بێین ملی سوننەتیك بگرین کە خەلکی هێشتا لێ‌ی تێنە گەیشتـون یا بەلایانەوە سەیرە، وای لێ بێ خەلکی سوننەتەکەش رەت بکەنەوە ئەو کەسانەش رەت بکەنەوە کە ئەم سوننە تانەیان لێ داوا دەکەن، بگرە هیچ کاریکی چاك و خراپیان لێ وەرناگرن!

پایـەکانی شەرعی خودا بە فێرکردنی بنچینەکانی بیرەباوەر (عقیدة) دەست پێ دەکات، دوا بەدوای ئەو فەرزو واجباتەکان ئینجا واز هێنانە لە قەدەغەلێ کراوەکان (المحرمات) وە بەجێ هێنانی سوننەتەکانی پێغەمبەر -(ﷺ)- وە خۆ دوورگرتن و خۆ پاراستن لە هەموو رەفتاریکی ناریك و ناتەواو.

بەکورتی، ئێمە پێویستیمان بەوە هەیە کە نەهێلین گرێ کوێرە لە نێوان مەسەلە سەرەکی وبنچینەیی‌یەکان لەلایەك و مەسەلە سادەو بچکولەکانی

لەلایەکی دیکەوە دروست بێت، ئەو قسانەش نەهێنە گوێحکەمانەوە کەوە دەلێت ئەبێ واز لەلایەنێکیان بهێنین بۆ لایەنەکەی تری، پێویستە سەرنجی بانگەوازیکاران بۆ سەر یەك شێواز رابکێشین ئەویش ئەوەیە کە هەر شتێك ماڵ خۆی بێ بدرێت.

هیچ کەم و کورتی نیە بۆ بانگەوازیکار کە بێت خەریکی فێر بوون یا فێرکردنی ئەوسوننەتانە بێت کە خەلکی لێی تێنەگە یشتون یاوەری ناگرن، وەکو کورت کردنەوەی جل و بەرگ بۆ ناوەراستی قاچ یا جوولاندنی پەنجەی شایە دمانی لە کاتی تەحیات خوێندندا چونکە ئەم مەسەلانە دەقی شەرعی‌یان لەسەر هاتووە بەمەرجێك لە مەسەلە گرنگەکانی تر دووری نەخانەوە یا باشتر وایە گەنجەکان فێربکرێن کە هەر بۆخۆیان ئەم سوننەتانە جێ بەجێ بکەن و تەنهایەو کە سانە بگوترێ کە ئاموژگاری وەردەگرن ئەم مەش لە شوێن و کاتی گونجاودا، لە هەندێ کات و شوێندا نەبێ ئەبێ لەراهی خودا واز لەم سوننەتە بهێنێ ئەگەر بینرا کە بەرژەوەندی شەرعی لەوەدایە، نەك لە ترسی زووبانی خەلك و لۆمەی لۆمەکاران!

راستی نیە، دادپەروەری نیە، زیاتر لە چواردە بەرگ لەسەر مەسەلەیەکی لاوەکی، یا ناسەرەکی بنووسرێ کەچی لەلایەك چەندەها بەلاو مەینەتی‌و دەردوناسۆر هاتۆتە سەر ئەم ئوممەتەو لەلایەکی تر ئەو خەلکە موسلمانە بەدوای چەندەها بیرو باوەرو بۆ چوونی پووچ کە وتوون! جا پێویستە بانگەوازیکار بزانێ دەردەکان چین دەرمانەکانیش کامەن!

کەسانیکی واش هەن کە لەبەر چەند مەسەلەیەکی گرنگ و سەرەکی ئەوانی تریان پشت گوێ خستووە.
بۆ نموونە:ـ

یەکێکیان دەڵێ:ـ من سەلەفیم کاتێ کە سەیری کە سایەتی عومەری کوری خەتتاب دەکەم وەکو ئەو عومەرە سەیری دەکەم کە بە دادگەری و یەکسانی فەرمانرەوایی لە نێوان خەلکدا کردووە، وەکو ئەو عومەرەی کە دەڵێ:ـ ئەگەر ئێسترێك لە عیراق بخزێ یا بکەوێ وا هەست دەکەم کە خوای گەورە پرسیارم لێ دەکات، ئەی عومەر بۆچی رێگات بۆ خۆش نەکردووە؟

من بەو چاوە سەیری عومەر ناکەم کە بەرگی کورتی لەبەر کردووە وریشی درێژی بەجێ هێشتووە چونکە مندال وابیر دەکەنەوە!!!

ئەمەبوو راو بۆچوونی هەندێك لە موسلمانان! یا سبحان الله! باشە بۆچی ئەبێ ئێمە شەخسیەتی عومەری کوری خەتتاب بکەین بەدوو بەش؟ عومەرێکی دادگەری فیداکارو مجاهد، کە هەست بە لێپرسراوێتی خۆی دەکات بەرامبەر بە خودا.

عومەرێکی تر پابەند بە تەواوی سوننەکانی پێغەمبەری خودا ـ﴿ﷺ﴾ـ لە رەوشت و ئاکارو کرداریدا ماشا بۆ عومەر هەرگیز بر.وای بەم (دوو رەنگی)یە نەبووە!

لەو کاتەی کە (عوتبەی کوری عامر) هات بۆ مەدینە پاش ئەوەی هەفتەیەك بەرێکاوە بوو بۆ ئەوەی مزگێنی ئازاد کردنی وولاتی شام بگەیەنێتە عومەری کوری خەتتاب کە ئەم هەواڵەی بە عومەر راگەیاند لە کەیف

خۆشیا دەستیان کرد بە بانگی «الله اکبر، والله الحمد» ئاڵە و کاتە کە ئیمامی عومەر سەیری (خف)[1] کانی پێی عوقبەی کرد و لێی پرسی: ئەوە چەند رۆژە لە پێت کردووە؟

ووتی:ـ هەفتەیەك دەبێت مەسحی لەسەر دەکەم!

عومەر فەرمووی: (اصبت السنة)[2] واتە: بەگوێرەی سوننەت هەڵس و کەوتت کردووە و کارەکەت تەواوە.

ئیبنو تەیمیە[3] و هەندێ زانای تریش ئەو ریوایەتەیان بەراست لە قەڵەم داوە.

کە وابـو خەریك بوونی عومەری کوڕی خەتتاب بە مەسەلەی ئازاد کردنی گەلان و جیهان خستنە ژێر رکێفی ئیسلام نەبووە بەر بەستێك لە بەردەم عومەردا تاوەکو واز لە سوننەتەکان بهێنێ یا هەندێ ووردە بابەتی تر پشت گوێ بخات.

لە کاتێکـدا عومـەری کوڕی خەتتاب رەزامەندی خوای لەسەر بێت لەسـەرە مەرگا بوو پاش بریندار بوون و لێدرانی بە چەند خەنجە رێك لەسـەر جێگـا غەمی ئەوەی بوو ئاخـۆ ئەبێ کێ بکـرێ بەجێ نشینی پێغەمبەر ـ﴿ﷺ﴾ـ وە رابەرو سەر کردەی موسلمانان، لە راستیدا ئەم مەسـەلەیەش مەسەلەیەکی گرنگ ترسناك بوو، بەڵام سەرباری هەموو ئەمـانـەش ئیمامی عومەر خوای لێ رازی بێ وازی لە مەسەلەو بابەتی ووردکاریەکان نەهێنا بۆ نموونە:ـ

---

(١) (الخف) وەکو گۆرەوی وایە لە پێستە دروست دەکرێ.

(٢) (بەیهەقی) ریوایەتی کردووە.

(٣) لە (الفتاوی) وەرگیراوە.

لەوکاتــەی سەر گەرمی دیـاری کردن هەلبژاردنی جێ تشین بوون منالێك هاتەژوورەوە، ئەویش بەچاکە باسی کرد، کە چووە دەرەوە عومەر بینی کە کراسەکەی زۆر شۆڕە ووتی ئەم منالەم بۆ بانگ بکەنەوە!!

کە هات فەرمووی:- برازای خۆم کەمێ کراسەکەت هەلکێشەو کورتی بکـەرەوە، چونکـە و پاك و خاو ێنترەو خوداش وای پێ خۆش ترە[1] ودا بەدوای ئەوە بەم برینداری و شریە رووی کردە سەحابەکان و بابەتیکی ووردی لە (مــیرات) بۆ روون کردنــەوەو ڕاو بۆ چوونــی لەگــەلدا دەگۆڕیێنەوە، بەلای ئەوەوە مەسەلە گرنگ و سەرەکی یەکان لەگەل بابەتە وورەکاندا بە جۆریکی وا بەیەکەوە بەندبوون کە هیچیان ئەوی تریانی نەئەتواندەوە،

بۆیە تامەچێژیکی تایبەتیان ئەبەخشی دوور لە هەموو رەقەکاری ورکە بەریەك!

## (و) دادگەری لە تێروانینیکی هەمەلایەنە بۆ ئیسلام:-

ئایینی خودا بۆ ئەوە هاتووە کە گشت کاروبارەکانی ژیانی ئادەمیزاد ببـات بەڕێـوە لە ئاستی تاك و کۆمــەل دا، وەلە بوارەکانی ئابووری، کۆمەلایەتی رامیاری زانستی، وگشت بوارەکانی تری ژیان، بۆیە. خوای گەورە لۆمــەی بەنی ئیسرائیلیــەکــان دەکــات کاتی کە هەنــدێ بەشی ئایینەکەیان فەرامۆش کرد دەفەرموێ:-

«فنســوا حظاء ممــا ذکــروا بە فاغرینا بینهم العداوة والبغضاء الی یوم القیامة» (المائدة: ١٤)

---

(١) (بوخاری) ریوایەتی کردووە.

کەواتە: کورت هەڵهێنان و تەسك کردنەوەی ئیسلام لەسەر چەند لایەنیکی و فەرامۆش کردنی بەشەکانی تر خووی میللەتە فەوتاوەکانی پێشوە، وە هۆیــەکی سەرەکی‌یــە بۆ دروست بوونی ناریکی و نا تەبــایی لە نێوان موسلمانانددا بە گشتی و بانگەوازیکاران بە تایبەتی.

هەندێ لە موسلمانان ئیسلام هەر بەوە تێ گەیشتوون کە بریتی‌یە لە چەند پەرستگاری و چەند ڕێو ڕەسمیك! بایەخیش تەنها بە شەو نوێژو زیکرو چەند دروشمیکی تر دەدەن، بگرە هەندێ کاری وا ئەنجام دەدەن کە دوورە لە شەریعــەتی خودا! ئەوەتە هەندێك ئاکاری سۆفیانەی وەها وشك بەجێ دەهێنن کە گەڵی دوورە لە واقیعی ژیانی ئیسلام و هەقیقەتی ئەم ئایینە بیرۆزە، یەکێك لەوانە بەشانازی‌یەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ:

کابرایەکی ڕۆژئاوایی زۆر لە گەڵمان دانیشت و گوێی بۆ شل کردین، پاشان لەسەری نووسیوین و دەڵێ: ئەمانە هیچ جێگای ترس نین، چونکە هەر باسی بن عاردو سەرەوەی ئاسمانەکان دەکەن!!

باسی مردن و قەبرو قیامەت، باسی باوەڕی بەخودا و بەفریشتەکان و هاتنی ڕۆژی قیامەت و، بەهەشت و ئاگری دۆزەخە! خوایە بمانپارێزی!!
بەڵام هرچی کاروباری ژیان وسەر ڕووی زەمینە، ئەوە هەر قسەی لێ‌مەکە! وەکو ئەوەي هیچ پەیوەندی‌یەکی بەوانەوە نەبێت!!

هەندیکی تر لە موسلمانان هەن کە ئیسلام وەکو ئیسلامیکی سیاسی وەردەگرن، هەوڵ و تیکۆشانی بەردەوامی ئەوان تەنها بۆ پیکەوەنانی تاقم و گرۆی سیــاسی‌و کوکــردنــەوەی دۆست و لایــەنەگیرو دەنگ هێنان لە هەڵبــژاردن و چوونــە نیـّو پەرلەمان و پەروەردەکردنی لاوەکانە لەسەر خەباتی سیاسی.

هەندیکی تریان خەریکن بە ئیسلامیکی زانستیانە، خەرکیی فێربوون و لیکۆلینەوەیە لە سووننەتەکانی پێغەمبەرو ﷺ فەرمووده پیرۆزەکانی، وە خەریك دەبێ بە جیاکردنەوەی فەرموودە ریوایەت بە هێزەکان لەوانەی تر کە لاوازن، وە خەلکی لە فەرمـوودە لاوازو دروست کراوەکـان ئاگادار دەکەنەوە، جا وورده وورده ئەمەش ووشکیو رەقییەکی بە دوا دیت دوور لە واقیعی دلتـەزێنی ئەم ئوممەتە، نازانێ ئاخۆ چ پیلانیك لە ئارادایە بۆئیسلام و موسلمانان!

پیش ئەوەی هیچ لیکدانەوەیەك بۆ ئەم قسانە بکریت. من دەلیم:

یەکـەم: ئیسلام ئەو سێ لایەنەو چەند لایەنی تریش بەیەکەوە دەگریتە خۆی، ئاینیکـە هاتـووە بەنـدەکـان بە پەروەردگارەوە ببەستیتەوە، لێی بترسن و لە رەحمەتەکەشی بێ ئومید نەبن، ئەمەش بە هۆی عیبادەت و پەرستن کاریەکان دروست دەبیت ئیسلام بۆ ئەوە هاتووە کە ژیانی مرۆڤ بەریوەببات حوکم و یاسای خودا لە نێو بەندەکانی بچەسپێنێ، نەهاتووە بەندەکان گۆشە گیر بکات و لە واقیعی ژیان دووریان بخاتەوە!

سیاسەتیش بەشیکە لەم ئایینە پیرۆزەو لێی جیا ناکریتەوە، خەبات کردن لەم مەیدانەدا بۆ گەیشتن بە ئامانجە پیرۆزەکانی ئیسلام بە هەر شیوازیکی شەرعی بیت ئەرکی سەرشانی هەموو موسلمانیکی غەم خۆرو بانگەوازیکارە.

ئیسلام هاتووە خوا پەرستیو چۆنیەتی ژیان بەریوەبردنمان فیر بکات، و ژیان هاوسەنگ بکات و ریکی بخات بە هۆی پابەند بوون بە سەرچاوە سەرەکیەکـانی ئیسـلامەوە دیتە دی کە ئەویش بریتیە لە قورئانی

پیرۆزو سوونەتی بەرزی پێغەمبەر ﷺ نەك شوێن کەوتنی هەواو هەوەس و ئارەزوەکان.

- کەوابوو خالیدەکەم ئەوەی دەرخست کە پێویستە بەگوێرەی ئیسلام و لە ژیان روانگەی شەریعەتی خواوە سەیری گشت بوارەکانی ژیان بکرێن

دووەم: لەوانە بە هەموو کەسێك نەتوانێ لە گشت بوارەکاندا شارەزاو لێهاتــوو بێت، چونکە توانای مرۆڤ سنووردارە، ئەگەر ئەو توانایە لە بوارێکدا خرایەگەڕ لەوانەیە لە بوارەکانی تر بێ ئاگابێت، یالەوانی تردا کزو لاواز بێت، دوا بەدوای ئەمەش زەوق و ئارەزووی ئەو خەڵکە وەکو یەك نیە، جۆری بایەخ دانی هەرکەسێك بە گوێرەی سروشتی ئەوکەسەیە، دەبینی یەکێك خواپەرستی دەکات و زۆریش خێرخوازە، بەلآم لەوانەیەچ شەرع زان نەبێت، زانیاریەکی ئەوتۆی نەبێ دەربارەی ئیسلام.

هەر مرۆڤێـك خوای گەورە بەهرەیەکی پێ داوە، لە نێو هاوەڵەکانی پێغەمبەر ﷺ تیایاندا هەبوو قارەمانی جەنگ و جیهاد بوو وەکو: خالیدی کوڕی وەلیـد، لە هەمان کاتدا زاناو شەرع زانی لێهاتووی وەکو ئیبنو عەبباس، و ئیبنو مەسعود، هەر لەو کاتەدا خواپەرست ر دونیا نەویستی وەکو ئەبو زەڕ ی غەففاری یان لەناودا هەڵکەوت.

جا لەم جۆرە کەسانەو کەسانی تر بینایەکی ئیسلامی تەواو پێك هات، هیواش هەڵکەوتوون کە هەموو ئەو وەسفانەیان لێ هاتۆتە دی، ئەگەرچی ئەم بابــەتــە ژمارەیان کەمن، هەروەکو لە نێو هاوەڵەکانی پێغەمبەر ﷺ پیاوی وەکو ئەبو بەکری سەددیق و عومەری کوڕی خەتتاب و عوسمانی کوڕی عەففــان و عەلی کوڕی ئەبی تالیب (خــوایــان لێ رازی بێت)

دەرکەوتن، وە کەلیکی تریش لەم جۆرە پیاوانە دوای بەدوای ئەوان هاتن و پەیدابوون.

**سێیەم**: دەبێ ئێمە هەندیکمان تەواوکەری ئەوانی ترمان بین، نابێ هەلبـژاردنی جۆری بایەخ دان ببێتە هۆی پەرتەوازەیی و تانە و تەشەر گرتنە یەکتری، یا هەریەکەمان ئەوی ترمان تاوانبار بکات بە نەفامی و نەزانی، یا یەکتری تاوانبار کردن بە خەریک بوون بەمەسەلە لاوەکی یەکان، یا خود یەکتری تاوانبارکردن بە ووشکی و خەریک بوون بە دونیا.

نەخێر، با هەر موسلمانیك بەبراکەی خۆی بڵێ کە بەقەدەر توانای خۆی رۆڵی خۆی دیوەو، کەلێنێکی بۆ پڕکردینەوە، کە لەنێوان خۆی و خوا دوعای خێری بۆ بکاو ریگا بەکەس نەدات کە تانەو تەشەری تێ بگرن.

با «حیزبایەتی» بەسەر بەشیکی ئەم ئیسلامەوە نەکەین و دژایەتی ئەو کەسانەش نەکەین کە بە بەشەکانی تری ئەم ئاینەوە خەریکن، لە جیاتی ئەوە ئەگەر یەکێك کەلێنێکی بۆ گرتین زۆر سوپاسیشی بکەین.

**چوارەم**: پێویستە لەوەش ئاگادار بین کە نابێ خەریك بوون بەزانست یا پەرستن کاری یەکـان وەیـا خەباتی سیاسی وامان لێ بکات کە ئامانجە سەرەکیەکانی بانگەوازی کردنمان لەیاد بچێتەوە.

مرۆڤی بانگەوازیکار نابێ لە ئاستی هەندێ بابەتی پێویست بێ ئاگاو بێ غەم بێـت وەکـو شارەزا بوون لە بیروبـاوەڕی راست و دروست، وەشارەزابوون لە لە چۆنیەتی دەست نوێژگرتن و نوێژکردن و رۆژووگرتن

و.. تاد. هەروەها شارەزابوون لە هەندێ بابەتی کە پەیوەندی بە ژیانی رۆژانەمان هەیە وەکو چۆنیەتی هەڵس و کەوت لەگەڵ. خاوو خێزاندا، یا ئاگادار بوونەوە لە بڕیارو یاساکانی ئیسلام دەربارەی زەکات و بازرگانی کردن و چەندەها بڕیاری تر دەربارەی کاروپیشەکانی وەکو ئەندازیاری‌و پزیشکی.. گەلێکی تر.

ئێمە بەم ریگایە خۆمان لەوە دەپارێزین کە مەسەلەیەکی ئیسلام بەتوندی بگرین و.شەرە شەقیشی لەسەر بکەین؟

بایەخ دان بە پەسرتنەکان ئەگەر زانیاری‌یەکی شەرعی تەواو هەلقولاو لە (قورئان و سووننەت)ی لەگەڵدا نەبێت خاوەنەکەی بەرەو هەڵدێری سونیگەریێتی دەبات.

بایەخ دان بە بانگەوازی کردن ئەگەر لەسەر بنچینەی تیگەیشتن و شی‌کردنەوەی دەقەکان و زانین و زانیاریەکی تەواو نەبێت خاوەنەکەی ئا «مانجی بانگەوازەکەی ئەبێتە کوکردنەوەیان راکێشانی خەڵکی بۆ ناو گێژاوی بیدعەکاری یا کوکردنەوەو راکێشانی خەڵکێ بۆ مەبەستی تر.

## (ز) راست کردن لەگەڵ. واقیعدا:

هەندیك لە بانگەوازیکاران ـ لەو سەردەمەدا ـ وا دەزانن لەسەدەی پێنجەمی کۆچیدا دەژین! ئەو سەدەمیەی نەناسیوە کە تیایدا دەژی، نازانێ چی لە دەوروبەری رووداوەدات وچی رویداوە، هەروەکو کابرایەکی دەو جادەو کۆلانان بیر دەکاتەوە، وەکو ئەو خوتبە خوێنەی کە دەڵێن جاریکیان کۆنە کتێبیکی بەدەستەوە گرتبوو خوتبەی تیایدا دەخوێندوە لە

کۆتــایی دا دوعــای بۆ یەکێــك لە پاشــایــەکــانی عوسمــانی کردو کە ئێسقانەکەشی نەمابوو!!.

نەیدەزانی لە دونیا چ باسە، نەیدەزانی ئەو پاشایە بۆتەوە گڵ. و مشك و مار خواردوویەتیو، سەروەت و سامان و بگرە وەڵاتەکەیشی رۆژهەڵات و رۆژئاوا ـ دەستی بەسەردا گرتووە!

ئەو جۆرە بێئــاگــاییــیە ئەگــەر زۆریش دووبــارە نەبێتــەوە بەڵام بەبەردەوامی نمونەیان ماوەو دەمێنێ.

گەنجێك لێی پرسیم و ووتی: حیزبی (البعث) چیــیە؟

بیروبــاوەڕیان چیــیە؟ هەر ئەوەنییە کە بڕوایان بەزیندوو بوونەوە (البعث)ی رۆژی قیــامەت دا نیە؟ وا تێگەیشتبوو بۆیە ناونراوە (حزب البعث)( چونکە باوەڕیان نییە بە (یوم البعث)!

موسڵمان ئەبێ کار لە واقیع و دەوروبەرەکەی بکات، وەدەبێ جێی پەنجەی لە هەموو سەردەمێکدا دیاربێ، وە گەواهی دەر بێ لەسەر ئەو خەڵکە، وە لە ناخی خەم پەژارەی کۆمەڵەکەیدا بژی، وە لە هەموو بیرو بۆچوونە فیکریو سیاسیــیەکانی سەردەم ئاگادار بێت وە هەوڵ بدات بۆ دۆزینــەوەی ریگا چارە بۆ هەموو ئەو تەنگ چەڵەمەو گیروگرفتانەی کە دەورو بەرەکــەی تووشی هاتــوون، وە موســڵمــان دەبێ هەوڵ بدات بەرەنگــاریێ هەمــوو لادانێــك و ناراستیــەك بێتەوە وە لە رەگ و ریشەو بنــەچــەیــان شارەزایــان بێت، چونکــە هەرگیــز ناتــوانرێ بەرنامەو بۆ چوونــەکــانی ناحــەزان پووچــەڵ بکــرێتەوە ئەگەر شارەزایی تەواومان دەربارەی رەگ و سەرچاوەیان پەیدا نەکردبێ.

بەڵام مەرجیش نیــە هەموو بانگەوازیکاریك بەم جۆرە بێت ( بەڵکو بەلایەنی کەمەوە ئەبێ کۆمەڵە کەسانێکی بۆ تایبەت بکرێت کە بەم کارە هەستن و ئەو ئەرکە بخەنە ئەستۆی خۆیانەوە).

بانگـەوازیکـار دەبیٚ هەردەم لە بەرزەوە بروانیٚـە دەوروبـەرەکـەی، بڕوانیٚتە ڕووداوەکان، وەدەبیٚ موسلمانی بانگەوازیکار ببیٚتە چاوساغی کۆمەلەکەی لە هەموو بوارەکاندا.

لەمـەوبەر ووتمان هەندیك دوور لە واقیع دەژین، بەلاٚم هەندیکی تر هەن لەگەل واقیع یا لە ناویدا ئەتوێنەوە، واقیعی تالٚ دەوربەر بە دلیکی لەرزۆکەوە وەردەگرن و لیکی دەدەنەوە، جا بە هەر بیانوویەك بیٚت هەول دەدەن خۆیان لە ڕوو بەڕوو بوونەوە لەگەل واقیعی ناهەموار بپاریٚزن، یا ئەکەونە ژیٚر فشاری ئەو واقیعەو خۆی لەگەل دا دەگونجەینن.

بەلاٚم ڕاستی ئەوەیـە واقیعـەکـەت بنـاسو بیخـەیتـە ژیٚر تیشکی یاسایەکانی خودای گەورەو میهرەبانەوە.

## (ج) دادگەری لە هەلس و کەوت کردن لەگەل جیاوازی لە ڕاو بۆچوونەکاندا:ـ

بوونی جیاوازی نیٚوان خەلك شتیکی سروشتییە هەروەك خوای گەورە دەفەرمویٚ:

«ولا یزالون مختلفین الا من رحم ربك» (هود: ۱۱۸ ـ ۱۱۹)

هەرکـاتیٚ جیاوازی لە عەقل و تیگەیشتن هەبیٚ، جیاوازی لە نیازو مەبەست هەبیٚ، جیاوازی لە ئاستی زانین و زانیاری هەبیٚ، جیاوازیش لە ڕاو بوچوون هەر دەبیٚت.

هەنـدیٚ لە بانگـەوایکـاران داوای یەك ریزیو تەبایی و لەبیرکردنی

جیاوازیەکانی رابردوو دەکەن، بی ئەوەی سنووریك یا تەرازوویەك بۆ ئەم مەبەستە دابنێن، ئاخۆ ئەبێ یەك دڵو یەکریزی لەگەڵ. کێ دابگرێ؟
یا ئەبێ ئەوانەی خۆمانیان لێ بەدوور دەگرین چ جۆرەکە کەسانێکن؟
لە بەرابەر ئەم کۆمەڵەش کۆمەڵێکی تر هەن مەرجی زۆر توند بۆ تەبایی و یەك بوون دادەنێن، دەیانەوێ هەموو کەس وەك ئەوان بن. بگرە لە راو بۆچوونی تاقەکەسیشدا دەیانەوەی خاوەنی هەمان بۆچوونی ئەوان بن!

جا ئەگەر بێو کەسانێك راو بۆچوونێکی جیایان هەبێ لەگەڵ. ئەواندا، ئەوا هەر مەپرسە چۆن کێشان و پێوانێکیان بۆ دادەمەزرێنن و چ نرخ و بەهایەکیان بۆ دانانێن!
جا براو خوشکی بانگەوازیکار:

راستی و دادپەروەریت لەوەدایە کە تۆ بتوانێ ئەو جیاوازیانە قەبوول بکەی بەتایبەتی ئەگەر جیاوازیەکان لەسەر چەند بابەتێکی لاوەکی بن، یان لە سەر ئەو بابەتانە بێ کە زانایانی پێشوو لە سەری رێك نەکەوتوون، یان ئەو راو بۆ چوونــە جیــاوازانـــەی کە هەن دەربـــارەی چۆنیـــەتی بانگەوازیکردن و شێوازە شەرعیەکانی.... یان هەر لێکدانەوەو بۆ چوونێك بێت کە لە دەقەکانەوە سەرچاوەی گرتبێ نەك هەڵقوڵاوی هەواو هەوەس و ئارەزووەکان بێت، ئەمە رێگای بۆ دەچێ، بەڵام نەرمی نواندن لە ئاست ئەو کۆمـــەڵانـــەی کە بیروبـــاوەڕ.ی هەڵەو نامـــۆیـــان هەڵ. گرتـــووە، یا گومـــڕابـــوون ئەوانە یەك بوون و برایەتی لەگەڵیاندا بە هیچ کلۆجێك لەگەڵ. شەرعی خوادا ناگونجێ ئەقلی ساغیش پێی رازی نیە.

یا داوای ئەوە بکەی هیچ جیاوازی‌یەك نەمێنێت ئەوەشیان بەشێکە لە خەون و خەیاڵات!

## پێنجەم: سۆزێکی زیندوو

ئێمە پێویستیمان بە جۆرە بانگەوازیکاریك هەیە کە جەرگی بۆ ئیسلام و موسلمانان بسووتێ، بۆ ئەو واقیعە تالە بسووتی کە ئەمڕۆ لە سەرتاسەری جیهاندا دووچاری ئەم ئوممەتە هاتووە، بانگەوازیکاریك بە سۆزو بەزەیی بێت لەگەڵ براکانی، ئەو ئایایەتە لە خۆیدا بێنێتە دی کە دەفەرمووێ:ـ

«أشداء على الكفار رحماء بينهم» (الفتح:٢٩) لەگەڵ کافران و دوژمنانی خوادا توندو تیژبن و لە نێوان خۆشیاندا نەرم نیان و بەسۆزبن، نەك وەکو (خوارج)ەکان لەگەڵ موسلمان و بڕواداران شەڕیان دەکردو وازیشیان لەبت پەرستان هێنابوو.

پێویستە بڕواداری راستەقینە ئەو فەرموودەی پێغەمبەری پێشەوا ﴿ﷺ﴾ لە خۆیدا بینێتە جێ کە دەفەرموێ:

«مثل المؤمنين في توادهم و تراحمهم و تعاطفهم كمثل الجسد الواحد اذا اشتكى منه عضو تداعى له سائر الجسد بالسهر والحمى»[1]، بەڵێ پوختەی ئەم فەرموودەیە ئەوە دەگەیەنێ کە بڕواداران بۆ یەکتری وەك ئەندامەکانی یەك لاشەوان..

یاخود لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە:

---

(١) (بوخاری، موسلیم، ترمذی) لە ئەبی موسای ئەشعەریەوە ریوایەتیان کردووە.

«المؤمن للمؤمن كالبنيان يشد بعضه بعضاً»[1] براوادران بۆ یەکتری وەك خشتـەکـانی ناو دیواریك وان یەکیکیان ئەوی تریان دەبەستێتەوەو بە هێزی دەکات.

ئێمە زۆر پێویستیمان بە کەسانێك هەیە کە هەست بە ئێش و ئازاری برا موسلمانەکانی بکات، ئەگەر زانی وا بەلایەکی هاتۆتە سەرغەمی بۆ بخواو ماتەمی دایبگرێ، با هەندێ کەم کورڕیو بید مەشیان هەبووبێ، مامۆستا رەشید رەزا زۆر خەم خۆری موسلمانان بووە، ئەگەر بیزانیایە موسلمانێك توشی ناخـۆشیـەك هاتـووە ئەوا پەژارەو خەفـەتیـاریـەکەی لە روویدا دەردەکـەوت، وەبە پێچەوانەشەوە بە خۆشی موسلمانان دلخۆش دەبوو، بۆیـە هەمـوو جارێـك دایکی ئەگەر بیدیتبوایە کە کوڕەکەی خەم دای گرتووە، لێی دەپرسی:

هاکوڕم دیسان چیتە؟ هەبێ و نەبێ
موسلمانێك لەوولاتی چین وەفاتی کردووە!

چونکە دەیزانی کوڕەکەی دل. خۆشیو دل. تەنگی‌یەکەی بە موسلمانانەوە بە ستراوەتەوە، لە راستیدا ئەوەیە خۆشەویستی و (ولاء)ی راستەقینە بۆ موسلمانان.

★ وەکو بەشێك لەم سۆزە زیندووە ئەبێ دڵمان بە هەڵەو کەم کوڕیەکانی موسلمانان بسوتێ و هەر لادانێك لە رێبازەکەی خودا ببێتە مایەی خەم و

---

(١) (بوخاری، موسلیم) ریوایەتیان کردووە، لە حەدیسی (نوعمانی کوری بەشیر)ەوە.

خەفـەت لە دل. و دەروونماندا، هەروەها هەر فەسادیو خراپەكاریەكی تریش لەم بابەتە.

ئیمەی موسلمان لە جیاتی ئەوەی دوورە پەریز بوەستین پیویستە وەكو پریشك هەول. دەین ئەو خەلكە نەخۆشە چارەسەر بكەین بەپیی تواناو دەسەلاتمان.

پیویستە ئەو سۆزە زیندووە وامان لی بكات هەلویستی مەردانە بنوینین بەرامبەر خۆمان و مال و منالمان. فەرمانیان پی بكەین بە چاكەو ئیمان، وەریگا بگرین لە كوفرو خراپەكاری وە هەر شتیكی تر كە خوای گەورە پیی ناخۆش بی.

زۆرن ئەوانــەی باسی ئیسلام دەكەن لەوانەیە بانگەوازیش بكەن، بەلام ئەوانــەی خاوەنی سۆزیكی زیندوون ژمارەیان كەمە، چونكە ئەگەر ئەو سۆزە لە دلی بانگەوازیكار پەیدابوو كار لە بانگەوازیی یەكەی دەكات و بەشـداری بوونی لە خەم پەژارەی موسلمـانــان دەكـات و بەرەكەت و بەرهەمیشی دەبیت.

هەر مرۆڤیك خاوەنی ئەو سۆزە زیندووە نەبیت، تەنها بۆ خۆیو مال. و منــالەكـەی دەژی، دەیــەوەی تام لە وژیانە وەربگری بی ئەوەی بیر لە موسلمــانــان بكـاتــەوە، بەراستی ئەو كەسانە خۆشویستی و (ولاء)ی راستــەقینەیان بۆ موسلمانان نیە، ئەو جۆرە كەسانە هەر چەندی باسی ئیسلام و كاری ئیسلامی و بانگەوازی بكەن وەكو ئەو كەسانە وان كە بەكری شین و ر.ۆر.ۆ ئەگیرن و سەرچۆپی ماتەمی نەگرنەدەست:
زۆرهەن لەسەر ئەوە لی راهاتوون كە لە كۆر.و ئاهەنگ و بیرەوەریەكاندا

قسەو ووتار پێش کەش بکەن و بلێنەوە.. یا چەند رستەیەك دەرازێننەوە دوور لە هەموو تین و گور.یکی دلسۆزانەو، دوور لە غیرەتی ئیسلامی.
داخەکەم بۆتۆ.. ئەی ئوممەتی مەحەممەد... چەند بە حەژمەت کە سانیکی دل. گەرم و جگەر سۆزی!!

## شەشەم: ناواتەمنحی (الطموح)

مەبەست لەم رەوشتە ئەوەیە کە مروڤ خۆویست نەبێ و تەنها بۆ خۆی نەژی، بەلکو دەبێ وەکو پێغەمبەری پێشەوا ﴿ﷺ﴾ بوگەل ئەموتەکەی بژی، هەروەکو حەزرەتی عائیشە باسی دەکات کاتێ کە عەبدولا.ی کور.ی شەقیق (ر.خ) پرسیاری کرد: ئایا پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ بە دانیشتنەوە نوێژی دەکرد؟

لە وەلا.مدا ووتی: (نعم، بعدما، حطمه الناس)[1] بەلێ پاش ئەوەی خەلکی هیلاك و شەکەتیان کرد. بەردەوام پێشوازی لە خەلکی دەکرد، بەری.ی دەکردن فەرمانی بۆ دەردەکردن، ئاگاداری دەکردنەوە، وەتەحەمولی ئەو هەموو کوفر و نەفامی، و گومرای.یەی دەکرد ئارامی لەسەر دەگرت، بەوە خەلکی ماندوویان کردو پەکیان خست تاوای لێ هات پیری زوّری بۆ.هێناو کەوت.

ئاینی پیروزی ئیسلام چەند پلە و پایەی تیدا هەیە؛ ئیسلامە، ئیمانە، ئیحسانە، بیجگە لەم دابەش کردنەش، لە سورەتی (فاطر)یش دا بەندەکانی خوا دەکرین بەسێ تاقمەوە:

---

(١) (ئەحمەد، ئەبوداود، موسلیم) ریوایەتی کردووە.

«ثم اورثنا الكتاب الذين اصطفينا من عبادنا فمنهم ظالم نفسه ومنهم مقتصد ومنهم سابق بالخيرات ظالم لنفسه ومنهم مقتصد ومنهم سابق بالخيرات باذن الله ذلك هو الفضل الكبير» (فاطر:٣٢)

لەم ئایەتانەدا خوای گەورە خولکەی کافرو ستەمکاران لە خولکەی خواناس و برواداران جیا دەکاتەوە، وە لە نێو خولکەی ئیسلامەتیش دا چەند پلەوپایەیەك دیاری دەکات. هەروەکو لە فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ)

دەربارەی (الفرقة الناجية) دەدوێ:
لە پێشدا ئیسلام بەوە ناودەبات کە دەرگایەکی سەرەکی‌یە بۆ چوونە بەهەشت، کەسێك ناچێتە بەهەشت ئەگەر موسلمان نەبێت، لەناو ئەو بازنە گەورەدا بازنەیەکی بچووك هەیە ئەویش بازنەی ( الفرقة الناجية)یە ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە پابەندن بە خوو رەوشتی راست و موسلمانانە، خاوەنی بیروباوەڕێکی پاکن و هیچی تر ناکەن، بازنەی سێهەم و لە هەموان بچووك تر بازنەی (الطائفة المنصورە)یە. ئەمەش بەرزترین پلەو پایەیە.

ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە خۆیان فرۆشتووە بە خواو پارێزگاری لەم دینە دەکەن، ئێش ئازاری لە پێناودا دەچێژن ولە کۆتایشدا خوای گەورە سەریان دەخات.

جا پێویستە موسلمان هەردەم بە ئاواتی ئەم پلەو پایەیە بێت هەوڵ و ئارەزووی بۆ ئەوە بێ کە بیگاتێ.
مرۆڤی موسلمان پێویستە لە ئایینەکەیدا چاوبڕێتە ئەو کەسانەی کە لەو لە پێش ترن و بالاترن، لە مەسەلەی ژیانی دونیاش سەیری ئەوکەسانە بکات کە لەو نزمترن.

پێویستە هەوڵ بدەین وەك پیاو چاك و زاناكان بین، ئەوانەی خزمەتێكی چاكیان پێش كەش بە ئیسلام كردووە، ئەوكاتە مرۆڤ ئەتوانێ خێرێكی بۆ خۆی و میللەتەكەی پێوە بێت، نابێ بە بەشی كەم رازی بین، نابێ لە چاكەو خەیـردا تێر بین تا گەیشتن بە بەهەشت و وەدەست هێنانی رەزامەندی خودای گەورە.

## دوا ووتە

پێویستە بانگەوازیكار نموونەی موسلمانێكی رێك و پێك بێت، مامۆستا و پێشەوا بێت، لە هەموو كارێكی نارێك هەرچەند بچووكیش بێ خۆی بە دوور بگرێت زێـدە دەست بڵاو نەبێت لەو شتانەی خوای گەورە بۆی حەلاڵ كردووین.

★ پێـویستـە بانگـەوازیكـار بە چاوێكی نزم سەیری دونیا بكات و مل ملانێی لەسـەر نەكات بۆ ئەوەی خەلكی بڕوای پێ بكەن و ببێتە جێ متمانەی خەلكی .

گرنـگ ئەوەیـە بانگـەوازیكـار دونیـا بخـاتە ژێر پێیەكانی بۆ خزمەتی بیروڕاكەی بە كاری بهێنێ، نەك خزمەتی دونیا بكات، تا خەلكی بزانن كە نە دونیای مەبەستەو نە پلەو پایەش.

جا ئەگەر بانگەوازیكار بیەوێ ببێتە نموونەیەكی چاك بۆ خەلكی و چاوی لێ بكرێ پێویستە قسەو كرداری یەك بن، هەروەكو قورئانی پیرۆز لەسەر زووبانی حەزرەتی شوعەیب (سلاوی خوای لەسەر بێت) دەفەرموێ:

«وما ارید ان اخالفكم الی ما انهاكم عنه ان ارید الا الاصلاح ما استطعت وما توفیقي الا بالله علیه توكلت والیه انیب» (هود ۸۸.

بۆیە زانا ناتەواو ناریکەکان خەڵکی تەنها بە قسە بۆ لای ئیسلام بانگ دەکەن، بەڵام خۆیان نایکەن و بە جێی ناهێنن نە وەك تووشی ئێش ئازار و زیان و ماندوو بوون بن.

جا براو خوشکی بانگەوازیکار پێویستە بەردەوام پێشەواو نموونە بیت لە قسەو کرداردا.

لێرەدا مەسەلەیەك هەیە پێویستە ئاگاداری بین ئەویش ئەوەیە کە گەلی کەس وا تیگەیشتوون کە موسلمانی بانگەوازیکار نابێت باسی شتیك بکات کە خۆی بەتەواوی بە جێی نەهێناوە، یان قەت نابێ نەهی لە شتیك بکات کە خۆیشی هێشتا وازی لێ نەهێناوە بەڵکو ئەمەشیان هەڵەیە چونکە لە قورئان و سوننەت دا بەڵگەی لەسەر هەیە کە مرۆڤ هەر چەندە کەم و کوڕی هەبێت بەڵام هەردەبێ فەرمـان بە چاکـە بکات و ریگا لە خراپە بگرێت ئەگەر بۆ خۆیشی تێی کەوتبێ، هەندیك لە گەورە زانایان دەڵێن:

مرۆڤ ئەگەر مەی خۆرەوەش بێت هەر دەبێ نەهی لەم کارە خراپە بکات. من چۆن ئەتوانم بە بیانووی ئەوەی کەوا هەڵەیەکم هەیە، یا گوناهیکی زل تر بکەم ئەویش بێ دەنگ بوونە لە ئاستی خراپەو فەسادی دا،تاکە مەرج بۆ ئەم کارە ئەوەیە کە بە دڵسۆزی و بە راستگۆیی بێت، نەك بە نیفاق و بۆ خەڵەتاندنی خەڵکی یا بۆ لاف و گەزاف لێدان.

ئەگەر باوکیك جگەرەکیش بێت مانای ئەوە نیە ریگا بدات منداڵەکانی فێری

جگەرەکێشان بن! بەڵکو پێویستە قەدەغەیان لێ بکات و تێیان بگەیەنێ کە ئەو تووش بووەو ناتوانێ وازی لێ بهێنێ.

ولو لم يَعظ الناس من هو مذنب
فمن يعظ العاصين بعد محمد

ئەگەر بڵێین نابێ مرۆڤی گوناهبار ئامۆژگاری خەڵکی بکات، ئەی لە دوای محمد ﴿ﷺ﴾ کێ ئەبێ بێت ئامۆژگاری و ڕێنموونی خراپەکاران بکات؟

بانگــەوازیکـار بەرامبـەر هەر هەڵـەو خراپـەیەکی برایەکی موسڵمانی با چاکـەیەکی لە بەرامبـەردا بنوێنێ، سینە فراوان بێ، هەروەکو پێغەمبەر ﴿ﷺ﴾ بکات بەرامبەر ستەم لێ کردنی بەخشین و لێبووردنی هەبێت وە ئەگەر کەسێك هیچی پێ نەدابایە، ئەو پێی ئەدا ئەگەر کەسێك سەردانی نەگردبایە سەردانی ئەکرد. ئەوە بوو ڕەوشتی پێغەمبەران (سلاوی خوایان لەسەربێت).

خودای گەورە و میهرەبان ئێمەو ئێوەش بخاتە سەر ڕاستە ڕێگای خۆی، گومـــڕا نەبــین و کەسیش گومـڕا نەکـەین، خودا بە میهـرەبـانی خۆی بمانبەخشێ. فهو اهل التقوى واهل المغفرة
والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته
سبحانك اللهم وبحمدك اشهد ان لا اله الا انت استغفرك واتوب اليك

کۆتایی

# ناوەروك

لاپەرە